وەهبی وەققاس ئۆغلوو

چوارەم چاپ

3

# یاداشتنامەی مامۆستایەک







و: د.زانا ئەحمەد



بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب: یاداشتنامەی مامۆستایەك

بەرگی سێیەم

نووسەر: وەهبی وەققاس ئۆغڵوو

وەرگێڕ: د. زانا ئەحمەد

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٦٣٧)ی ساڵی ٢٠٠٩ ی پێدراوە



## ئایا مرۆڤ لە مەیموونەوە هاتووە؟

بەدرێـژایی ئـەو ماوەیـەی مامۆسـتا بـووم گرنگییـەکی زۆرم بـە پرسیاری قوتابییان دەدا و بە هەندم وەردەگرت. هەر بۆیـە ئـەوانیش هــەر پرســیارێکیان لا گەلاڵــە ببووایــە بــێ هــیچ ســڵ کردنەوەیـەك دەیانپرسی. خۆ ئەم (یادداشتنامە)یەی بـەر دەسـتتان زۆربـەی زۆری لە وەڵامی ئەو پرسیارانە پێکهاتووە. هەندێ لـەو پرسـیارانە لـە هـەر پۆلێکدا چەند جارێك دەکرانەوە. یەك لـەوانە ئەمـە بوو: **"ئایا مرۆڤ لـە مەیموونەوە هاتووە؟"**

کە ئەم پرسیارە کرا پۆل درا بە یەکدا. یەکێك هەڵسایەوە و وتی:

– دەڵێی ئەم هاورێیەمان هیچ لە وانەی پێشوو نەگەیشتووە. ئەی نەمانخوێند کـە یـەکێك لـە شـەش پایەکـەی بـاوەڕ، بـاوەڕ بوونـە بـە پێغەمبەران (سەلامی خوایـان لەسـەر بـێ)؟ حـەزرەتی ئـادەم یەکـەم مرۆڤ و یەکەم پێغەمبەرە.

یەکێکی تر بەرگێکی ئەنسکلۆپێدیای لە جانتاکەی دەرهێنا، وێنەکانی ناوی پیشان دا و وتی:

- بەڵام زانست پێمان دەڵێت لە مەیموونەوە هاتووین.

یەکێکی تریش پرسی:

- باشە مامۆستا! ئێمە باوەڕ بە کامیان بکەین، ئاین یان زانست؟

جارێك لە قوتابییەکم -کە قسەیەکی وای کرد- پرسی:

- تۆ باوەڕ بە کامیان دەکەیت؟

داماوە نەیزانی چی بڵێت، دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر وتی:

- بە هەردووکیان، هەم ئاین هەمیش زانست. قوتابییەکان بەم وەڵامە تا بڵێی پێکەنین. بەڵام کە من وتم: "ئەمەش گوزارشت لە ڕاستییەك دەکات"، تا ماوەیەك سەرسام و کڕ بوون.

پێم وتن:

**- بەڵێ، ئاینەکەی ئێمە هەموو ئەوەی زانست دەیسەلمێنێت، پەسند دەکات. لەم ڕوانگەیەوە هەرگیز ڕووبەڕووی زانست نابێتەوە. یەکێك لەو بەڵگانەی کە ڕاستیی ئەم ئاینە دەسەلمێنێت ئەوەیە کە لەگەڵ ئەقڵ و زانست دەسازێت.**

(ناڵان) داوای مۆڵەتی قسەکردنی کرد و وتی:

- مامۆستا! واتە باوەڕ بکەین بەوەی کە لە مەیموونەوە هاتووین؟

- نەخێر، کوا من شتی وام وتووە؟!

– ئەی نەتوت ئەوەی زانست بیسەلمێنێت ئاینەکەمان قبووڵییەتی؟! ئێ زانستیش دەڵێت لە مەیموونەوە هاتووین!

– بەڵێ ناڵان، ئاینی ئێمە هەموو شتێکی زانستیی قبووڵە، بەلام لە مەیموونەوە هاتنی مرۆڤی قبووڵ نییە، چونکە ئەوە ڕاستییەکی زانستی نییە.

محەمەدی فەیلەسووف هەڵیدایێ:

– مامۆستا! مەسەلەی لە مەیموونەوە هاتن لەو ناوە مایەوە. نە لە ئاین جێی بووەوە نە لە زانست، ئەی کەوایە چییە و لە کوێوە هاتووە؟

– ئەگەر ئارام بگرن و بەوریاییەوە گوێم لێبگرن، چارەسەری ئەم مەسەلەیە دەکەین.

– وا گوێمان هەڵخستووە، مامۆستا!

– مادام وایە، منیش بۆتان باس دەکەم.



"ئەرێ بیردۆزی پەرەسەندن زانستە یان ئایدیۆلۆژیا؟ بەم حاڵەیەوە ئایدیۆلۆژیایە، چونکە پشت بە قبووڵ کردن دەبەستێت نەك بەڵگە".

(مات هیوس)ی زیندەوەرزانی ئینگلیز و شارەزا لە بیردۆزی پەرەسەندن.

# بیردۆزێکی سواو

- رۆڵەکانم! ئەم بیرە -واتە لە مەیموونەوە هاتنی مرۆڤ- «بیردۆز»ە، بە گوزارشتی کۆن «گریمانە»یە. ئەوە نییە هەندێ جار کە قسە دەکەین دەڵێین گریمان... بە گوزارشتی نوێ دەڵێین «دانان»، بەو واتایەی وا دادەنێین فلان شت وایە. زانایەك وا دادەنێت شتێك بوونی هەیە، جا ڕەنگە هەبێت و ڕەنگیشە نەبێت. ئەو دەڵێت بە ڕای من وایە، هەندێ بانگەشە دەکات و چەند بەڵگەیەك دەخاتە ڕوو. بەمانە دەوترێت «بیردۆز- *Theory*» یان «گریمانە- *Hypothesis*». گریمانە بیروبۆچوون یا شێوازی ڕاڤەیەکە بە ئومێدی ئەوەی بێتە سەلماندن دەخرێتە ڕوو.

جا ئەگەر ئەو بیردۆزانە بەشێوەیەکی زانستییانە سەلمێنران پلەی ڕەهایی وەردەگرن. ئەوساش لە گریمانەوە دەبن بە زانست.

**ئەم بیری لە مەیموونەوە هاتنەی مرۆڤ - کە لە «بیردۆزی پەرەسەندن»ەوە سەرچاوەی گرتووە- ئەوە سەد ساڵە خراوەتە ڕوو کەچی هێشتا نەسەلمێنراوە. بە دەستەواژەیەکی تر بیردۆزێکی مێژووییە و لە مێژە خانەنشین کراوە و لەمڕۆدا نەماوە.**

چاودێری پۆل وتی:

- مامۆستا! تۆ دەڵێیت خانەنشین کراوە، بەڵام تا ئێستایش هەر باوی ماوە و، لە کتێبە پەیڕەو کراوەکانی قوتابخانە و ئەنسکلۆپێدیا

و هۆكارەكـــانی ڕاگەیاندنـــدا، باســـی لێـــوە دەكرێـــت و لەســـەری دەنووسرێت.

- بـەڵێ وایـە، وێـڕای ئـەوەی بـاوی نـەماوە هێشـتا باسـی لێـوە دەكرێت و لەسەری دەنووسرێت. بـەڵام بـا بـیر لـەوە بكەینـەوە: ئایـا بۆچی سەرەڕای ئەوەی كە بیردۆزێكی سواوە، هێشتا لـەمرۆدا بـوونی ماوە؟ ئەم پرسیارە گەلێك گرنگە، چونكە هەر كاتێـك لـە وەڵامەكـەی گەیشتین لەوەش تێدەگەین كە ویستراوە لە ڕێی ئەمەوە چی بكرێت.

بیردۆزی پەرەسەندن بۆ یەكـەم جـار لـە سـەدەی نۆزدەهەمـدا لـە ئەوروپا هاتووەتە ئاراوە لەو ساڵانەدا، ئەوروپا بە دەسـت تـەوژمێكی بەتینی ماددەگەرییـەوە لـە هەژانـدا بـوو. دژایـەتیی ئـاین بەگشـتی و كڵێســا و قەشــەكان بەتایبــەتی لــە بــرەودا بــوو. لــەو دەورانــەدا بەرەوپێشچوونە زانستییەكان بە سوود وەرگرتن لـە خاڵـە لاوازەكـانی ئـاینی مەسـیحی چـۆكیان بـە بیروبـاوەڕ دادابـوو. ماتریـالیزم واتـە ماددەگەری شوێنی باوەڕ بە خودای مەزنی گرتبـووەوە. بـەهۆی ئـەو فشارەی پێشتر پیاوانی كڵێسا خستبوویانە سـەر زانایـان و ڕێگرییـان لە هەوڵە زانستییەكانیان دەكرد ڕق و قین لە دڵی زانستخوازان پەنگی خواردبووەوە، كە هەلیان بۆ ڕەخسا بـە بیردۆزەكانیـان كەوتنـە لاواز كردنی مەسیحییەت و لەناوبردنی ئەو بیروباوەڕەی لەڕێی ئەم ئاینەوە بڵاودەبووەوە.

بــەم جــۆرە ســـەدەی نۆزدەهــــەم بوویـــوو بـــە گۆرەپـــانی بەگژیەکداچوونی کڵێسا و زانستخوازان. بەهۆی ئـەم کێشمەکێشـەوە ماددەگەران (ماتریالیستەکان) هەر بیردۆزێکیان دەست بکەوتایە، بـە جۆرێك بەرگرییان لێدەکرد وەك ئەوەی پلـەی براوەییـی وەرگرتبێـت. بیردۆزی پەرەسەندنیش، ئەگەر چی نەشسـەلمێنرابوو، بـەڵام بـەهۆی ئـەوەی بـە کـەڵکیان دەهـات، لەلایـەن ماددەگەرانـەوە وەك ئـەوەی سـەلمێنرابێت خرایـە بـەر بـاس و لەسـەر نووسـین. بـە گوزارشـتی هەنووکەیی کرا بە هۆکارێکی ڕێکلام.

ئـەوە نییـە ئێسـتاش لەگـەڵ تێپـەڕ بـوونی سـەدەیەك بەسـەریدا، هێشـتا چـەکێکی بـەکارە لـە جـەنگی نێـوان بـاوەڕدار و بێبـاوەڕان. ئەمڕۆکەش وەك بیرێکی لە ئەورووپاوە هەڵقوڵاو لای خۆمـان بـەجۆرێك لێـی دەڕوانرێـت وەك ئـەوەی هێشـتا کاریگـەر بێـت. ئەگـەر چـی لەوکاتەوە هێندە بەرهەمی گرنگ و زانستیی نووسراوە کـە ناتـەواویی بیردۆزەکە پیشان دەدەن، بەڵام لەبەرئەوەی پشـتیوانانی بیردۆزەکـە ڕێکلامێکی زیاتریان بۆ کردووە دەنگی ئەوان نابیسترێت.

نابێت ئەوەش لەبیربکەین کە هـەموو ئەوانـەی شـوێنی بیردۆزەکـە کـەوتوون نـازانن لەگـەڵ ئاییـندا دژە. زۆر کـەس هەیـە بـە زانسـتیی دادەنێـت بۆیـە بـێ هـیچ لێپێچـینەوەیەك پەسـەندی دەکـات. دەبـێ ئـەوەش بـزانین کـە نـەزانییان لـە ئـایین هۆکـارێکی دیکەیـە. ئـا

لەبەرئەمانەیە بیردۆزی پەرەسەندن زۆر بڵاوبووەتەوە و تەنانەت وای لێهاتووە حسێبی زانستێکی سەلمێنراوی بۆ دەکرێت...

زۆرم پێ سەیر بوو کە چۆن محەمەدی فەیلەسووف تا ئێستا نەهاتووەتە گۆ، تا بۆ دوا جار خۆی پێ نەگیرا و کەوتە پرسیار کردن:

- باشە، مامۆستا! بنچینە و بیری سەرەکیی ئەم بیردۆزە چییە؟

چاودێری پۆل وتی:

- مامۆستا! یەعنی ئیللا دەبێ محەمەد قسە بکات و فەیلەسووفیەتیی خۆی دەربخات؟ کە جەنابت قسە دەکەیت تەواوی سەرنجمان دەخەینە سەر تۆ. کاتێك بابەتەکە زۆر بەجوانی بەرەو پێشەوە دەچێت، لە پڕ محەمەد خۆی تێهەڵدەقورتێنێ و پرسیارێك دەکات کە دڵنیاین دواتر خۆت دێیتە سەری، بەو جۆرە لێمانی تێك دەدات. بەکورتییەکەی بێئارامی دەنوێنێت، مەگەر یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی فەیلەسووفان ئارام نەگرتنە؟!

- نەخێر، بەپێچەوانەوە...

فەیلەسووفەکان ئارامگرن، چونکە کەسانێکن دەزانن ددان بەخۆدا بگرن و بکەونە



بیرکردنەوە. محەمەد لەبەرئەوەی باسەکەی بە دڵە، گەرەکیەتی هەر چی زووترە فێری ببێت، لەو ڕووەوە لێبووردەبن بەرانبەری و بیبەخشن.

محەمەد بە چەشنێك ڕووی لە چاودێری پۆل کرد، وەك ئەوەبوو پێی بڵێت: "پێت چۆن بوو؟"

من قسەکەم وا لێك دا:

– بۆ ئەوەی لێتانی تێك نەدات، دڵنیام محەمەد لەمەودوا کەمتر پرسیار دەکات، واش هەست دەکەم بابیی ئەوەندە ئیرادەی بەهێزە بتوانێت بەسەر ئەو خووەیدا زاڵ ببێت. بەم جۆرە دوای ئەوەی دەمەقاڵەکەمان گۆڕی بۆ قسەی خۆش، گەڕاینەوە سەر باسەکەمان:



● مەیموونی (A. afarensis) کە داروینیستان بە باوەگەورەی مرۆڤایەتیی دادەنێن.

## ئەو هەلومەرجەی بیردۆزی پەرەسەندنی تێدا هاتە ئاراوە

– بەڵێ! ئینجا با بێینە سەر ئەو سەردەمەی بیردۆزەکەی تێدا دەرکەوت و ئەو کەسەی داینا.

یەکەم کەس کە ئەم بیردۆزەی دانا (داروین)ی زانای ئینگلیز بوو،

که بە ڕەچەڵەك جوولەکەیە. داروین لەساڵی (١٨٠٩)دا هاتووەتە دونیاوە. باوکی و تەنانەت باپیریشی هەر پزیشك بوونە. لەبەرئەوەی نەیدەتوانی بڕیاری کۆتایی بدات و لەسەر شتێك بەردەوام بێت، وازی لە خوێندنی پزیشکی هێنا و چووە سەر «خوداناسی» واتە خوێندنی ئایینی، بەڵام بەمەش دڵی دانەکەوت و کەوتە توێژینەوە لە بواری زانستە سروشتییەکاندا. بە کەشتییەکی توێژینەوە بۆ ماوەی پێنج ساڵ گەشتێکی لە ئەمریکای باشوور و دورگەکانی زەریای هێمن و ئوسترالیا ئەنجام دا. لەو شوێنانە بەبەردبووەکان و پاشماوەی ئێسکە پەیکەرەکانی کۆکردەوە.

داروین بیست ساڵ دوای ئەو گەشتەی، تەواوی بانگەشەکانی لە بەرهەمەکەیدا کۆکردەوە. دوای سێ ساڵ و لە ساڵی (١٨٥٩)دا کتێبەکەی بڵاوکردەوە.

داروین کتێبەکەی لە کاتێکی گەلێك لەباردا بڵاوکردەوە، چونکە لەو کاتەدا زریانێکی بەتینی ماددەگەری ئەورووپای گرتبووەوە. شەڕ لەگەڵ ئاینی مەسیحی کە بەتەواوی لاواز بووبوو هەڵگیرسابوو. گشت بیروباوەڕەکانی تریش کەوتبوونە بەر هێرشی ئەو جەنگەی دژ بە پاپا و قەشەکان هەڵگیرسێنرابوو.

تەنانەت هەندێ لە بێباوەڕان ئەوەندە دڵخۆش بووبوون، دەیانوت: "ئیدی خودا مرد". چونکە وایان لێك دەدایەوە کە ئەوە زانستە و جێی ئاین و بیروباوەڕەکان دەگرێتەوە. بۆیە سەدەی نۆزدەهەم بوو

بەو سەدەیەی مرۆڤایەتی کەوتە متمانە کردن بە ئەقڵ و ملنان بەرەو ئاقاری نکووڵی کردن لە بوونی خودا.

ئا لەم هەلومەرجەدا بوو کتێبەکەی داروین بڵاوبووەوە. یەکەم چاپی هەر یەکەم ڕۆژ لە بازاڕدا نەما. بەم چەشنە بێباوەڕان سەرکەوتنێکی تریشیان تۆمار کرد.

## بیری سەرەکیی بیردۆزی پەرەسەندن

- ئینجا نۆرەی پرسیارەکەی محەمەدی فەیلەسووفە، بیردۆزی پەرەسەندن چییە و بیرە سەرەکییەکەی چییە؟

بەگشتی پوختەی بیردۆزی پەرەسەندن ئەمەیە:

١- گشت زیندەوەران جا چ ڕووەك چ گیاندار، لەیەکترییەوە دروست بوونە، دەشگونجێت هەموویان لە تاکە زیندەوەرێکەوە هاتبن. ڕووەك و گیانلەبەران ڕۆژبەڕۆژ گۆڕانیان بەسەردا هاتووە تا گەیشتوونەتە سەر شێوەی ئەمڕۆیان.

٢- ڕووەك و گیانداران لە پێناوی مانەوە لە ژیان، لە ململانێ و شەڕێکی دەستەویەخەدان. لەم ململانێیەدا ئەوانەی زیاتر لەگەڵ بارودۆخەکەدا هەڵدەکەن لە ژیان دەمێننەوە و ئەوانی تریش وەچەیان دەبڕێتەوە. ئەوانەی دەمێننەوە نەوە دەخەنەوە و لەگەڵ

کاتـدا گۆڕانیـان بەسـەردا دێـت، ئـەو گۆڕانانـە بـۆ نـەوەی نـوێش دەگوازرێنەوە.

٣- پەرەسەندنی سروشت کە بۆ ملیۆنان ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە، بێ هـیچ ئامـانج و مەبەسـتێك و بـە ڕێککـەوت بـەهۆی گەشەسـەندنی وردە زیندەوەرێکەوە بووە.

محەمەدی فەیلەسووف بە شەرمێکەوە پرسی:

- مامۆستا! دیسانەوە ناچارم قسە بکەم... یەعنی ئەو مەسەلەی لە مەیموونەوە هاتنەی مرۆڤـ - کـە ئێمـە بەدوایـدا وێڵـین- لـەم بیردۆزەدا نییـە؟ ئێمـە هـەر کـە گوێبیسـتی «بیردۆزی پەرەسـەندن» دەبـین، یەکسـەر مەسەلەی لە مەیموونەوە هاتنی مرۆڤـمان بـە بـیردا دێـت. تـا ئێسـتا وامـان زانیـوە کـە ئەمـە بیردۆزی پەرەسەندنە.



● بیردۆزەکـەی داروین چـاك بـە کـەڵکی کارڵ مارکس هات، کە لە هەوڵی بێوچاندا بوو بۆ ئەوەی ڕافەیەکی دژ بە ئاینانە بە جیهاندا بڵاو بکاتەوە. ئـەوە بـوو مـارکس (داس کاپیتـاڵ) - کـە گـرنگترین کتێبـی بوو- کردە دیاری بۆ داروین.

- محەمەد! لە مەیموونەوە هاتنە ئارا، یەك لە دەرهاوێشتە لاوەکییەکانی بیردۆزەکەیە. لەو بنەمایانەی پێشـتر ئامـاژەمـان پێـدا ئـەوەش هەیـە. دێینـە سـەر ئـەو

باسەش، بەلام بۆ ئەوەی لە بنەڕەتەوە تێبگەین، با یەك بە یەك و بەشێوەیەکی زانستی لەم یاسایانە ورد ببینەوە.

## چۆن بێگیان گیانی بەبەرداهات؟

با سەرەتا چاوێك بە خاڵی یەکەمدا بخشێنین: "ئایا ڕێی تێدەچێت ڕووەك و گیانلەبەران لە یەك سەرچاوەوە هاتبن؟"

ئەوانەی باوەڕیان بە بیردۆزەکە هەیە دەڵێن: "بەڵێ". لە گریمانە و (وا دانان)یش بەولاوە، بەڵگەیەکیان نییە.

بەلام ئایا ئەو بیرە چییە کە دەیانەوێت لەڕێی ئەمەوە بیخەنە گەڕ؟ لایەنگرانی بیردۆزەکە وای لێکدەدەنەوە کە زیندەوەرانی ئێستا لە ڕەچەڵەکی واوە هاتوون کە کەم گەشەکردوو بوونە، ئەمانیش پێشتر لە ئەنجامی گەشەکردن لە تاکە خانەیەکەوە هاتوونەتە بوون.



● گالیلۆ گالیلی بەهۆی ئەوەی وتی: دونیا دەخولێتەوە کڵێسا دایە دادگای پشکنین و سەرەنجامیش حوکم درا... سیستەمی پاپایەتی دوای ٣٥٠ ساڵ ئینجا ئەو هەڵە مێژووییەی خۆی بۆ دەرکەوت.

باشه، ئەی خانە کە بچووکترین پێکهاتەی زیندەوەرانە چۆن دروست بوو؟ ئەوان دەڵێن: خانەش لە ئەنجامی گەشەسەندنی ماددە پرۆتینییەکانی ناوییەوە هاتووەتە ئاراوە.

بەڵام چۆن دەگونجێ ماددەیەکی بێگیان کە توانای جوولەی نەبێت ببێتە زیندەوەرێکی گیاندار. دەزانن پێکهاتەی ئەو نازیندانەش کە بە مردوو و بێگیانیان ئەژمار دەکەین چەند ناوازە و سەرسوڕهێنەرە؟ دەزانن چ جیاوازییەکی بێشومار لەنێوان ماددە و زیندەوەرە گیاندارەکاندا هەیە؟ بێ بوونی دەست تێوەردانێکی دەرەکی چۆن ماددەیەکی بێگیان گیانی بەبەردا دێت؟


● هیتلەر لە بیردۆزی (ڕەگەزی باڵا)کەیدا پشتی بە بیردۆزی پەرەسەندن بەستبوو، تەنانەت کتێبەکەشی (کۆششی من) هەڵقولاوی (ململانێ لەپێناو مانەوە)کەی داروین بوو.

وەڵامی شوێنکەوتووانی پەرەسەندن ئەوەیە کە هەر لەخۆوە و بەڕێککەوت ڕوو دەدات، ئەمە لەکاتێکدا کە بونیادی تاکە خانەیەك هێندە ئاڵۆز و کامڵە کە بە هیچ جۆرێك ڕێی تێناچێت بەڕێککەوت

دروست ببێت. شتی جوان و مانادار هەر چەند سادەش بێت بەڕێککەوت نایاتە بوون، چ جای خانە کە بەردی بناغەی زیندەوەرانە!

سەیر بکەن (ئیدوین جۆنکلین)ی زانا لەم بارەیەوە چی دەڵێت: "بانگەشەکردن بۆ بەڕێککەوت هاتنە بوونی ژیان لەسەر زەوی، هێندەی بانگەشەکردن بۆ ئەوەی کە فەرهەنگێکی گەورە لە ئەنجامی تەقینەوەیەك لەنێو چاپخانەیەکدا چاپ بووە ناماقووڵە."

چۆن مادده هاتووەتە بوون؟ حەز دەکەن با زانایەکی بیانی وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە؟

(ماکس پلانك) دەڵێت:

"مادده بەهۆی هێز و دەسەڵاتێکەوە دێتە بوون. لەنێو ماددەدا (کۆمەڵەی خۆر)ی بچووك بچووك هەن. ئەم کۆمەڵانە کە بە ئەتۆم و ئەلیکترۆنەکان ناو دەبرێن، بەر لە پەرش و بڵاوبوونی مادده دەگرن. کاتێك لە گەردووندا هێز و توانایەکی لەو چەشنە نییە، دەبێت قودرەتێکی زانا و بەئاگا هەبێت کە گەردوونی ڕاگرتووە و ناهێڵێت پەرتەوازە ببێت. ئا ئەم قودرەتەیە کە سەرچاوەی ماددەیە. ناوی ئەو قودرەتەش (ئەڵڵا)یە."

# ڕێککەوت لە گەردووندا جێی نابێتەوە

بـــەپێی بیروبـــاوەڕی ئێمـــە ڕووەك و گیانلەبـــەران لـــە ڕێـــی گەشەسەندنی زیندەوەرێکی بەڕێککەوت دروست بووەوە نەهاتوونەتە بوون، بەڵکو هەر یەکـە و بـەجیا لەلایـەن خـوداوە بـەدیهێنراون. هـەر ڕووەك و گیانلەبـەرێك لـەجێی خۆیـەوە بەڵگەیـە لەسـەر بـەتوانایی و ژیـری و دەسـتڕەنگینیی کردگـار و سـەرجەمیان بـۆ خزمـەتی ئێمـەی مرۆڤ هێنراونەتە بوون.

خودا هەموو شتێکی بۆ مەبەسـت و ئامـانجێکی دیـار بـەدیهێناوە. بەڵام بە بۆچوونی ئـەوان، زینـدەوەران بەڕێککـەوت دروسـت بوونـە و هیچ مەبەست و ئامانجێکی دیاریکراویان لە پشـتەوە نییـە. نـەك هـەر زیندەوەران، بەڵکو خودی مرۆڤـیش هەر بە ڕێککەوت دروسـت بـووە. بە ڕای ئەوان، بوونەوەرە سـادە برپڕەدارەکـان پـەرەیان سـەندووە و بوونەتە مەیموون، مەیموونەکانیش لای خۆیانەوە پـەرەیان سـەندووە تا بوونە بە مرۆڤ.

ئەمە لە کاتێکدا کە لە مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەکەکاندا ڕێکوپێکییەکی وا مەزن هەیە، کە بە هیچ جۆرێك ڕێی تێناچێت بە ڕێککەوت بووبێـت. ئینجـا بـەوەی کـە ئـەو ڕێکـوپێکی و بـێ کەموکوڕییـەیان دووبـارە دەبێتەوە، هێندەی دی بوار بۆ ڕێککەوت نامێنێتـەوە. شـتی جـوان و

مانــادار ســەدان و هــەزاران و ملێونــان جــار بــە ڕێککــەوت دووبــارە نابێتەوە.

بەمانــە ئــەوە ڕوون دەبێتــەوە کــە یەکــەم بانگەشــەی بــاوەڕدارانی بــیردۆزی پەرەســەندن، شــتێکی هەڵبەســتراوە و لەگــەڵ ژیریــی یــەك ناگرێتەوە. چی بوو ئەم بانگەشەی یەکەمە؟ با چاودێری پۆل بۆمانی بلێتەوە...

– مامۆســـتا! بـــە ڕای بـــاوەڕدارانی ئـــەو بـــیردۆزە ســـەرجەمی زینــدەوەران لــە تاکــە بوونەوەرێکــەوە و، ئــەویش لــە بوونــەوەرێکی بێگیانــەوە واتــە لــە مــاددەوە هاتوونەتــە بــوون. زینــدەوەران دوای ئەوەی پەرەیان سەندووە، بەم بارەی ئەمڕۆکەیان گەیشتوون.

– ئافەرین چاودێر! یەکەم بانگەشەیان ئەمە بوو. باشە ناڕەواییی ئەم خاڵەتان بۆ ڕوون بووەوە؟

| |
|---|
| لـە سـاڵێك لـەو سـاڵانەی کـە بیردۆزەکـەی داروین بـاوی بـوو، یـەکێك بەرگرییەکی زۆری لەو بیردۆزە دەکرد.<br>ژیرێك کە بە بێدەنگییەوە گوێی لـە یەکە یەکەی بەڵگەکانی دەگـرت ئەم دێڕە شیعرەی (شیناسی)ی شاعیری بەسەردا خوێندەوە:<br>**چۆن باوەڕ ناکەم بەوەی کە ئەیڵێیت**<br>**کە خۆت وەك بەڵگە لەبەر دەستما بیت**<br>بـەو مانایـەی: "کاتێـك یـەکێکی وەك تـۆ لەبـەر دەسـتدا بێـت وەك نموونە، چۆن باوەڕ ناکەم مرۆڤ لە مەیموونەوە هاتبێت". |




● بــەرگی پێشــەوەی ژمارەیــەکی گۆڤاری (Discover - دۆزینەوە) کە لە هەموو جیهاندا ناسراوە، بە مانشێتێکی گــەورە لەســەری نووســراوە: "داروین لەبەردەم لێپرسینەوەدایە".

لە کاتێکدا داروین لەبەر ڕۆشنایی ڕاسـتییە زانسـتییەکاندا لێپێچـینەوەی لەگەڵدا دەکرێت، دەمارگیرەکانی لەمـەڕ خۆمان هـەر هـەڵێکیان چـنگ بکـەوێت، بــە دەســـتکەوتی دەزانـــن و ئـــەم بیردۆزەیـان کردووەتـە ئامرازێـك بـۆ فریودانی نەوەی نوێ.

– بـەڵێ، مامۆسـتا! بۆمـان ڕوون بـووەوە. چـونکە چـۆن دەشـێ ماددەی بێگیان ببێتە بوونەوەرێکی گیاندار. پشتیوانانی پەرەسـەندن زۆر گاڵتەجاڕانـە ئەمـە ڕاڤـە دەکـەن، بـەوەی دەڵـێن لـە خـۆوە و بـە ڕێککەوت. ئەمە لە کاتێکدایـە کـە کـارێکی وا ئـاڵۆز و مـەزن و پـڕ لـە هونەرکاری بە هیچ جۆرێك ڕێی تێناچـێت بـە ڕێککـەوت ببێـت. کـار و بەرهەمی زۆر لەمە سادەتر بە ڕێککەوت ڕوو نادات، چ جای ئەمە؟

– فەرموو، (نەلان)! بزانم تۆ چ قسەیەکی زیاترت هەیە؟

– مامۆستا! بۆ ئەوەی شـتێکی بێگیـان، کـە وتمـان بێگیـان واتـە نەزان و بێهەست و بێبزاوت و کەڕ و نابینا، گـۆڕانی بـە سـەردا بێـت و ببێت بە شتێکی تر، دەبێت دەستتێوەردانێکی دەرەکـی هـەبێت. بـێ

بوونی بکەرێك یان کاریگەرییەکی دەرەکی بێگیانێك ناگۆڕێت بۆ شتێکی تر. لەم سۆنگەیەوە باسکردنی هاتنە بوونی شتێك بە ڕێککەوت، زانستیی نییە. ماوەتەوە ئەوەی کە زیندەوەری ئاوا کامڵ و ڕێکوپێك و جوان (کە تەنانەت مرۆڤیش ناتوانێت دروستیان بکات) باس کردنی بە ڕێککەوت دروستبوونیان لە سەیر سەیرترە.



– بەڵێ ڕاستە، شتی بێگیان بە ڕێککەوت نابێت بە گیاندار، وا دیارە هەموو لایەك لەمە گەیشتووە. ئەی دەگونجێت زیندەوەرێك لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا پەرەبسێنێت و ببێت بە زیندەوەرێکی تری تەواو جیا لە پێشووی؟

– نەخێر، مامۆستا! چونکە وا پێویست دەکات یەکێك بڕیار لەسەر ئەمە بدات، باشە کێ دەیدات؟ خۆ زیندەوەرەکە خۆی ناتوانێت بڕیارێکی وا بدات، ئەگەر زیندەوەران بیانتوانیبایە ئەو بڕیارە بدەن، هیچ زیندەوەرێك نەدەما، هەر یەکەیان پەرەی بە خۆی دەدا و خۆی دەکرد بە یەکێکی باڵاتر. یانیش دەبێت یەکێکی تر ئەو بڕیارە بدات؟ ئەمەش ڕێی تێناچێت. چونکە ئەوەی ئەو بڕیارە دەدات، دەبێ بەقەد ئەوە بەتوانا بێت لە باریدا بێت جێبەجێی بکات. ئەگەر یەکێکی وا هەبێت، کێیە؟

هەر وەك چۆن زیندەوەرەكە لەو توانایە مەحرومە، دایك و باوكیشی هەر وان. ئەی سروشت دەتوانێت ئەمە بكات؟ لە وانەی ڕابردووماندا ئەوەشمان ڕوون كردەوە كە ئەمیش چەندە بێتوانا و نەزانە و هەر بۆیەش لە بەدیهێنەریی گەلێك بە دوورە.

بەو پێیەی كە دانی بڕیاری پەرەسەندن بە ڕێككەوت نابێت و نایەتە جێبەجێ كردن، ئەم بانگەشەیەی داروینیستان بێ بنەمایە.

## ئایا ژیان ململانێیە؟

– ئینجا با بێینە سەر دووەم بانگەشەیان. چی بوو؟ كێ بۆمانی دەڵێتەوە؟

– ئاژەڵ و ڕووەكەكان لە پێناوی مانەوەدا لە شەڕێكی سەختدان، لەم شەڕەدا بەهێزەكان سەردەكەون و دەمێننەوە، هەر چی لاوازەكانیشە لە شانۆی ژیان دەردەكرێنە دەرەوە.

– ئافەرین، یەشار! زۆر بەپوختی باست كرد. باشە چۆن دەتوانین وەڵامی ئەم بانگەشەیە بدەینەوە؟ دەتوانیت ئەمەش بڵێیت؟

– مامۆستا با كەمێك بیری لێبكەمەوە.

- باشە، یەشار! تۆ بیری لێبکەوە، بەڵام ڕەنگە کەسانێك هەبن بیانەوێت بەدەنگ بیری لێبکەنەوە، با جارێك گوێ لەوانە بگرین، ئەگەر هەن...

بەڵێ کەسانێك دەستیان بەرزکردووەتەوە، با بە سەرە ڕێیان پێبدەین:

- مامۆستا! ئەگەر وا دابنێین کە تەواوی بوونەوەران بۆ زاڵ بوون لە شەڕ و ململانێدان، ئەو کات بەرەو پێشچوون و هاوکارییەکانی دونیا بێڕاقە دەمێننەوە. ئەگەر هەر یەکە و سەنگەری لە هەموو ئەوانی تر گرتبایە، دونیا دەبوو بە گۆڕەپانی پێکدادان و هیچ شتێکی باش و جوان ڕووی نەدەدا، هاریکاری و هاودەنگی شوێنەواریان نەدەبوو، بەڵام ئێمە بەردەوام ئەمانە لە ژیاندا دەبینین. بەمجۆرە ئەو بانگەشەیە نارەوا و بێبنەما دەردەچێت کە دەڵێت: (هەموو بوونەوەرێك لە هەوڵی زاڵبووندایە).

- هەر بژیت، (ئۆیا)! پێدەچێت پێشتر لەم بابەتە وردبوو بیتەوە و بیرت لێکردبێتەوە.... چونکە ئەمانەی وتت، شتی وا سادە نین، هەر بە بیرکردنەوەیەکی سەرپێیی بوترێن.

- بەڵێ، مامۆستا! پێشتر ئەم بابەتەم لەگەڵ کاکە و دادەمدا تاوتوێ کردبوو.

– ده مادام وایه، ئەرکێکت پێدەسپێرم. چەند نموونەیەك لە هاریکارییەکانی نێو سروشت کۆبکەوەرە و بەپوختی لە دەفتەرێکدا بیاننووسەوە، تا لە وانەی داهاتوودا بۆ هاورێکانتی باس بکەیت.

ئینجا با بزانین (ئەسلّی) چیمان بۆ دەلّێت:

– ئەگەر ژیان بریتی بێت لەو شەڕەی هەردەم بەهێزەکان لە هەولّی زالّبوون بن تێیدا، بۆچی دایك و باوکانمان بەخێومان دەکەن و پێمان دەگەیەنن، بەجۆرێك زۆر لە خۆیان زیاتر گرنگیمان پێدەدەن؟ بەچکەی ئاژەلانیش هەر وان، دایکیان زۆر بە تەنگیانەوەیە و چاوی لێیانە. ماوەیەك لەمەوبەر لە تەلەفزیۆن شێرێك و بێچووەکەی پیشان دا، شێرە وێڕای ئەوەی بە دڕندە ناوی ڕۆیشتووە، هەر چی خواردنێکی دەستبکەوتایە یەکەم جار دەیهێنا بۆ بێچووەکەی کە لە بێشەکەیدا بوو.




● بلاوبوونەوەی کتێبە بەناوبانگەکەی داروین (On the origin of species – لەمەڕ بنچینەی جۆرەکانەوە) بوو بە خالّێکی وەرچەرخان لە جەنگی دژە ئاییندا.

- نموونەیەکی زۆر جوانە! ئێوەش هەوڵ بدەن کە سەیری تەلەفزیۆن دەکەن، هەر وا بە هەڕەمەکی سەیری مەکەن، بەڵکو ئەسڵی ئاسا بەسەرنجەوە سەیری بکەن و پەندی لێوەربگرن. هەڵبەتە مەبەستم ئەوە نییە هەر چییەك لە تەلەفزیۆن دەرچوو بەو جۆرە سەیری بکەن، مەبەستم تەنها شتە سوودبەخشەکانە.

بۆ وانەی داهاتوو هەمووتان لەم باسە بکۆڵنەوە، تاکو دووەمین بانگەشەی باوەڕدارانی پەرەسەندن بە هەمان شێوە زانستییانە شەنوکەو بکەین.

## ژیان هەرەوەزی و پشتی یەك گرتنە

بۆ وانەی دواترمان قوتابییەکان زۆر بەجوانی ئەرکەکەیان بەجێ گەیاندبوو. بەر لەوەی ناوی ئامادە نەبووان تۆمار بکرێت هەندێکیان بابەتەکەیان بیر دەخستمەوە و بەپەرۆش بوون بۆ ئەوەی لە بارەیەوە بدوێن.

پێش ئەوەی ڕێیان بدەم بدوێن، بۆ ئەوەی باشتر بابەتەکە شی بکەینەوە، سەرەیەکی وام بۆ دانان: سەرەتا لە ڕووەکەکانەوە، ئینجا لە ژیانی ئاژەڵان و دواتریش لە دونیا و گەردوون... لە دوای هەمووشیانەوە مرۆڤ، چونکە گومانی تێدا نییە خودا لە هەموو ئەمانەدا نموونەی بەتەنگەوەهاتنی یەکتریی داناوە.

– یەڵڵا با بە پێی ئەم ڕیزبەندییە بدوێین...

بەڵام چاودێری پۆل وای پێ باشتر بوو، بەپێچەوانەی ڕیزبەندییەکە واتە لە مرۆڤەوە دەست پێبکەین، بەڵام ئەو ڕایە بەرهەڵستکارییەکی زۆری بۆ دروست بوو، وا دیار بوو هەر یەکە و دەیویست لە نموونەی خۆیەوە دەست پێبکەین. مادام وای لێهات با هەر بە پێی ڕیزبەندییەکەی یەکەم جار لەسەری بڕۆین.

– بەڵێ، وا دیارە موراد دەیەوێت یەکەم کەس قسە بکات، با بزانین چ نموونەیەکمان لەسەر هاریکاری لە دونیای ڕووەکەکاندا بۆ دێنێتەوە؟

– مامۆستا! قەوزە ئاوییەکانی قووڵایی دەریاکان، هیچ خۆشییان لە سەرما نایەت، بە ساردیی زۆر لەناودەچن. لەم ڕوانگەیەوە مانەوەیان لە ژیان بەندە بە گەرم بوونەوەیانەوە، بەڵام هیچ پێویست ناکات بۆیان نیگەران بین، داخۆ کێ بە فریای ئەو بەستەزمانانە دەکەوێت و گەرمیان دەکاتەوە، چونکە کەڕووەکانی ژێر دەریا بەوپەڕی دڵسۆزییەوە ئەم ئەرکە دەگرنە ئەستۆ، بەوەی بەتەواوی دایان دەپۆشن، بەمجۆرە گەرمیان دەکەنەوە و نایەڵن لەناوبچن. هەر بەوەندەش ناوەستن، بەڵکو ئەو دوانەئۆکسیدی کاربۆنەی لە ڕێی هەناسەدانەوە دەری دەدەن، بە قەوزەکانی دەبەخشن. ئەوەندەی تریش خێرخوازیی خۆیان دەسەلمێنن کاتێك ئاوی پڕ لە خۆراکیان بۆ دەگوازنەوە.

هەڵبەتە ئەم یارمەتییە یەکلایەنە نییە، قەوزەکەش لەو ئاوە پڕ لە خۆراکەی لەلایەن کەڕووەکەوە دەستی کەوتووە، بە پڕۆسەیەك کە پێی دەوترێت: (ڕۆشنە پێکهاتن)، دەیگۆڕن بۆ خۆراکی ئەندامی و بە هاوبەشی لەگەڵ کەڕووەکە تێری لێدەخۆن.

– هەر بژی موراد! نموونەیەکی جوان و گێڕانەوەیەکی جوان بوو. هەر ئەم نموونەیە بەسە بۆ ئەوەی ئەو بانگەشەیەی داروین کە دەڵێت: "ژیان ململانێیە" پووچەڵ بکرێتەوە.

***

ئینجا با (ئەسڵی) نموونەیەکمان لەسەر هاریکاریی نێوان ئاژەڵان بداتێ:

– مامۆستا من سێ نموونەم لایە...

– تۆ یەکێکمان بۆ باس بکە، تا بتوانین گوێ لە هاوڕێکانیشت بگرین، ئەگەر ئەوانەی تۆ باس نەکران و کاتیشمان بە دەستەوە ما، ڕێگەت دەدەین دووانەکەی تریش باس بکەیت.

– نموونەی من لە بارەی (گورگە ماسی – *Sea bass*)ی خاڵخاڵ شینە. ئەم ماسییە دوای ئەوەی تێر دەخوات دەمی دەکاتەوە و بە بێدەنگی دەکەوێتە چاوەڕێ کردن، جۆرە ماسییەکی تر کە ناوی (کەروێشکە ماسی – *Lapin*)ە، دێت و خۆی دەکات بە دەمیدا. تا ئەم کەروێشکە ماسییە نەیاتە دەرەوە، گورگە ماسی دەمی داناخات. کەروێشکە ماسی پاککەرەوەی دەم و ددانی گورگە

ماسییە، خۆراکە زیادەکانی نێو دەم و ددانی دەخوات، بەم جۆرە ناو دەمی پاك دەکاتەوە. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە ئاژەڵان یارمەتیی یەکتری دەدەن نەك بەرهەڵستیی یەکتر بکەن. ئەگەر هەستی شەڕانگێزی و نەیاری بەسەریاندا زاڵ بوایە، ئایا کەروێشکە ماسی دەیتوانی ئاوا بەئاسانی لەناو دەمی گورگە ماسیدا بێت و بچێت؟ لەنێوانیاندا لێککەیشتن و هەرەوەزییەکی لە ڕاددەبەدەر هەیە، ئیدی ئەمە وا دەکات یەکێکیان ددانەکانی پاك ببێتەوە و ئەوی تریش سکی تێر ببێت.

– ئافەرین ئەسلّی! ئەوەش نموونەیەکی ئەوەندە جوانە هی ئەوەیە داروینیستان لە ئاستیدا شەرم دایان بگرێت. ئەگەر وەك ئەوەی ئەوان دەیڵێن ژیان ململانێ بوایە و لاوازەکان لەلایەن بەهێزەکانەوە بچەوسێنرایانەوە، گورگە ماسی لەبری ئەوەی ئاوا مۆڵەتی کەروێشکە ماسی بدات شۆڕی دەکردە خوارەوە و نۆشی گیانی دەکرد...

– ئەگەر چی هەست دەکەم محەمەد ئۆقرەی لێهەڵگیراوە، بەلام حەز دەکەم ئەوانە بدوێنم کە کەم بەشداری دەکەن. عەلی! با بزانین تۆ چ نموونەیەکمان لەسەر هاریکاریی دونیا دەدەیتێ؟

– مامۆستا! جوانترین نموونەی هاریکاری لە دونیادا بارانە، باران بە هانای خاکی لە توونیا شەق بوو و ڕووەکە سیسەکان دێت و تێرئاویان دەکات. باران نەبوایە، ڕووەك و درەختەکان –کە سەرچاوەی خۆراك و داو و دەرمانن و سەر زەوی دەڕازێننەوە– نەدەبوون. وەك بڵێی زەوی داوا دەکات و ئاسمانیش بارانی بۆ دەنێرێت. ئەمە نموونەیەکە لەسەر هەماهەنگیی نێوان ئاسمان و زەوی، ئەگەر لەجێی ئەمە شەڕ و ململانێ هەبوایە ژیان نەدەما.

– ئافەرین بۆ تۆ، عەلی! ئینجا با بێینە سەر بۆشاییی گەردوون... دەی با (ئۆیا) باسی بکات:



● ئەگەر ژیان ململانێ بێت، چ یاسا و هەستێکە وا لەم باڵندەیە دەکات ببێتە خزمەتکاری بێچووەکانی؟

– با بیرێك لە کۆمەڵەی خۆر بکەینەوە. خۆر بە هۆی ئەو هێزی ڕاکێشانەی خودا پێی بەخشیوە هەسارەکانی لە دەوری خۆی ڕاگرتووە، نایەڵێت هیچ هەسارەیەك نزیك یان دوور بکەوێتەوە. هەرچی هەسارەکانیشە دەوری ئەمیان داوە و لێی گرد بوونەتەوە. وەك بڵێی بە ڕابەرایەتیی خۆر، کۆمەڵەیەکیان دامەزراندووە. ئا بەم کۆمەڵە یان

گردبوونەوەیەیان دەوترێت: (کۆمەڵەی خۆر). جگە لەوەش هەر هەسارە و لەلای خۆیەوە کۆمەڵەیەکی تری هەیە، هەر وەکو چۆن هەتاو هەسارەی هەیە، ئەوانیش پاشکۆ (مانگ)یان هەیە. پاشکۆکان بەندن بە هەسارەکانەوە ئەوانیش بەندن بە هەتاوەوە. هەتاویش بە خۆی و دەست و پێوەندەکەیەوە بەندە بە گەلەستێرەی ڕێی کاکێشانەوە. ئەم کۆمەڵەی خۆرە بەو قەبەییەی خۆیەوە بەشێکی بچووکی گەلەستێرەی ڕێی کاکێشان پێك دێنێت. ئەم گەلەستێرەیەش بە ڕژێمێکی زۆر لە خۆی گەورەترەوە بەندە. هەموو ئەم هاوبەندییانەی گەردوون هاریکاری و هەماهەنگییەکی وا لە گەردووندا دەنوێنن کە ئەقڵ لە ئاستیاندا دۆش دادەمێنێت. ئەگەر لە گەردووندا هاریکاری نەبوایە، نە مانگەکان، نە هەسارەکان و نە گەلەئەستێرەکان نەدەبوون، سیستەم و جووڵەی هەر یەکەیان دەشێوا. بۆ نموونە: ئەگەر تەباییی نێوان خۆر و ئەستێرە نەبوایە ژیان لەسەر زەوی نەدەبوو، چونکە بێ گەرمی و ڕووناکیی خۆر هیچ زیندەوەرێك لەسەر زەوی نەدەژیا.

– ئافەرین، ئۆیا! ئینجا با ڕێ بە چاودێری پۆل بدەین تا دوا نموونەمان بداتێ. با نموونەکە لەسەر هاریکاریی نێو جەستەی مرۆڤ بێت.

– مامۆستا! هەر وەك دەزانین، جەستەی مرۆڤ لە گۆشت و ئێسك و ئاو و شتی وا پێك دێت. ئەم ماددانە بە ڕێسایەکی تایبەت لە گیاندا

گردبوونەتەوە و جەستەیان پێکهێناوە. بەو مانایەی جەستەی مرۆڤـ لـە ئاکـامی هاریکـاری و تـەبابیی نێـوان ئـەم مـاددە جۆراوجۆرانـەوە هاتووەتـە بـوون. لـە لایـەکی تـرەوە پێویسـتییەکانی ئـەو ملیۆنـان خانەیەی کە لەشی مرۆڤـ پێك دێنن لـە ڕێـی خوێنـەوە و بـە پـاڵنرانی لەلایەن دڵەوە دابین دەکرێت، تەواوی جەستەش لەلایەن ناوەندێکەوە ئاراستە دەکرێت کە مێشکە.



● ئاسمان لـە ڕێـی بارانـەوە فریـای ڕووەکـەکان دەکـەوێت و تێرئاویـان دەکات.

لـــەنێو بچـــووکترین خشـــتی پێکهێنەری لەشی مرۆڤـ کـە خانەیـە، هاریکارییـەکی سەرسـوڕهێنەر بـەدی دەکرێـت. لـە ئەندامـەکانی لەشماندا کە لە خانە پێکدێن بە هەمان شـێوە بنەماکانی وەك هاریکـاری و یـەکێتی فەرمانڕەوان. لە جەستەشماندا –کـە لە ئەندامەکانـەوە هاتووەتـە بـوون– هاریکـاری و پێکـەوە گونجـان هەیـە. بـۆ نموونـە: دەسـتێك دژ بـە دەستەکەی تر و چاوێك دژ بە چاوەکەی تر ناجووڵێتـەوە و ڕکابـەریی یەکتری ناکەن، بـەڵکو بەپێچـەوانەوە هـەر یەکـەیان بـە هانـای ئـەوی تـرەوە دێـت و یارمـەتیی دەدات تـاکو ئەرکـەکانی سـەر شـانی بـەبێ کەموکوڕی بەجێ بگەیەنێت.

- بـەڵێ، دیـارە چـاودێریش بـاش خـۆی ئامـادە کردبـوو، دەستخۆشیی لێدەکەم. مرۆڤ ئەم هەموو نموونەی هاریکاری و تەباییە ببینێت و لێی تێبگات چۆن دەتوانێت بەرگری لەوە بکات کە ژیان لـە شەڕ و ململانێ پێکهاتووە؟ مرۆڤ کە هەردەم لەلایەن هەتاو و هـەیڤ و ڕووەك و ئاژەڵانەوە خزمەت بکرێت، نابێت ڕێ بە خۆی بـدات بڵێـت "ژیـان ململانێیـە". ئـەم وتەیـە پشـت بـە نـەزانی دەبەسـتێت نـەك زانست. یەکێك بیر بکاتەوە، دەتوانێت ملیۆنان نموونە بدۆزێتـەوە کـە بیسـەلمێنێت خـودای تـاك و تـەنیا چ یەکیـەتی و هاریکارییـەکی خستووەتە نێو جیهانی بوونەوەرانەوە.

محەمـەدی فەیلەسـووف ئـۆقرەی لێهـەڵگیرابوو، بـە وتـەکانی ئـەو کۆتاییمان بە باسەکەمان هێنا:

- مامۆسـتا! بـەم جـۆرە ئـەو بیروبـاوەڕەی شـوێنکەوتووانی پەرەسەندن بـەرگریی لێدەکـەن و دەڵـێن: "ژیـان شـەڕ و ململانێیـە" پووچـەڵمان کـردەوە. بـەڵام ئایـا ئەوانـە کـە ئەوەنـدە بـە زانستـەوە خـەریکن، بـیر لەمانـە ناکەنـەوە؟ یـان ئـەوەتا نایانـەوێت بـیری لێبکەنەوە؟

محەمـەد ڕاسـتی دەکـرد، ئایـا ئەمانـەیان بـە بـیردا نایـات یـان نایانەوێت بیریـان لێبکەنـەوە؟ بـەڵام دەبـێ ئـەوەش بـزانین بـە چـاو داخستن شەو دانایات. ئەوەی چاوی دادەخات تەنها لە خۆی دەکاتە

شەو. ڕۆشناییی ڕاستییەکانیش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پتر تەنگ بە تاریکی هەڵدەچنن.

بێ بنەماییی سەرەکیترین بیری شوێنکەوتووانی پەرەسەندمان بۆ دەرکەوت، ئینجا دێینە سەر باسی:"لە مەیموونەوە هاتنە بوون"، کە زیاتر مەراقمان بوو.

تۆ بڵێی مرۆڤ لە ئەنجامی گەشەسەندنی مەیموونەوە هاتبێتە بوون؟ هەمووتان لەم باسە ورد ببنەوە، تاکو لە وانەی داهاتوودا وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە.



● ژیان لە بەردەم ئەو کەروێشکە کێوییەی لە وێنەکەدا دیارە تا بڵێی سەختە. چونکە پێیەکانی پێشەوەی کورتە. بەڵام ئەو کەروێشکانە تا ئێستا نە کۆچیان کردووە بۆ دارستان و باخچەگەلێك لەگەڵ پێیەکانیان بگونجێت، نە لە ڕێی بژاردە کردنیشەوە قڕیان تێکەوتووە. ئەی کوا ئەو بژاردە کردنەی داروین بانگەشەی بۆ دەکات؟!

# ئایا مرۆڤ لە ڕەگەزی مەیموونەوە هاتووە؟

لە وانەی دواترماندا چووینە سەر باسی: "لە مەیموونـەوە هـاتن". گشت قوتابییەکان یەك لـە دوای یـەك هاتنـە دوان و هـەوڵی ئـەوەیان دەدا ڕاڤەی ئەوە بکەن کە ناگونجێت مرۆڤ لە مەیموونەوە هاتبێت.

دەتوانین گرنگترین و ژیرانەترین بیر و بۆچـوونەکانی قوتابییـەکان لەم خاڵانەدا کۆ بکەینەوە:

١- تا بە داروین دەگات کەسێك نەبووە بەرگریی لەوە کردبێـت مرۆڤ لـە مەیموونـەوە هاتبێـت. بەپێچـەوانەوە هـەر باسـی ئـەوە کـراوە و نووسـراوە کـە بـاوە گـەورەی مـرۆڤ حـەزرەتی ئادەمـە. لای هـەموو میللەتێك چیرۆکی حەزرەتی ئادەم، نەوە لەدوای نەوە گێڕدراوەتەوە. لـە زەبـوور و تـەورات و قورئـانی پیرۆزیشـدا ئـەوە بەتـەواوی ڕوون کراوەتەوە کە مرۆڤ لە حەزرەتی ئادەمەوە هاتووە.

٢- مەسەلەی ئەوەی کە حـەزرەتی ئـادەم یەکـەمین مرۆڤــە، هێنـدە ڕوون و ئاشـکرایە بــە هــەموو مرۆڤــێك دەوترێـت: (ئــادەمی) یــان (ئادەمیزاد) واتە نەوەی ئادەم.

٣- هـیچ بەڵگەیـەکی زانسـتی و متمانـەپێکراو نییـە وەرچـەرخانی مەیموون بۆ مرۆڤ بسـەلمێنێت. هـیچ کەسـێك نـەبووە و نییـە ئـەوەی بینیبێت. هەرچی خودای گەورەیە ئاماژە بـەوە دەدات کـە حـەزرەتی

ئادەمی لە گڵ دروست کردووە تا ببێت بە باوکی مرۆڤایەتی. ئەوانەش کە لە سەدەی نۆزدەیەمەوە تا هەنووکە ئەو بانگەشەیە دەکەن، ئەو کۆمەڵە ئێسك و پرووسکە دەکەنە بەڵگە کە لە ئەنجامی هەڵکۆڵینەوە دۆزیویانەتەوە. ئەو ئێسکانەش بەگوێرەی ئەو شوێنانەی لێی دۆزراونەتەوە ناونراون مرۆی جاڤا، مرۆی پەکین....هتد.



هێلکاریی (نێن پارکەر)
*National Geographic*
ئەیلوولی ١٩٦٠



هێلکاریی (مۆریس ویلسن)



هێلکارییەك کە لە ٥ی نیسانی ١٩٦٤ لە (*Sunday Times*)دا بڵاوکراوەتەوە

● ئەم سێ هێلکارییە، سێ ڕاڤەی جیاوازی یەك کەللەسەرن – کە ناویان ناوە (A. robustus). ڕاڤەکردنی کەللەسەرێك بە سێ شێوەی ئاوا دوور لە یەك، نموونەیەکە لەسەر لاوازیی هێزی خەیاڵی شوێنکەوتووانی پەرەسەندن.

ماوەتەوە بڵێین چەندین گزیکاری لەم کەللەسەر و شەویلگانەدا کراوە، ئێسکی مەیموون و مرۆڤ تێکهەڵکێش کراوە بۆ ئەوەی بتوانرێ (پەرەسەندن)ی پێ بسەلمێنرێت. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ ئێسکی نوێ بە هی زۆر کۆن و هی زۆر کۆن بە تازە دانراوە، بەڵام زانا

ڕاستگۆکان لە ڕێی لێ توێژینەوەکانیانەوە چەواشەکاری و گزیکاریی ئەوانەیان دەرخستووە. چەندان کتێبی زانستیش لەم بارەیەوە بڵاوکراونەتەوە.

یەکێك لەو زانایانەی لە کەللەسەرێکی وای کۆڵیوەتەوە وتەیەکی سەرنج ڕاکێشی هەیە: **"یان ئەم کەللەسەرە ڕاست نییە، یانیش ئەوەی شوێنکەوتووانی پەرەسەندن دەیڵێن..."**

٤- ئەگەر لە یەکێك لەوانەی باوەڕیان بە پەرەسەندن هەیە بپرسین: "بۆچی مەیموونەکانی ئێستا نابن بە مرۆڤ؟"، دەڵێن:"جۆری ئەو مەیموونانەی دەبوون بە مرۆڤ جیا بوو لەوەی ئەمڕۆ، ئەو جۆرە مەیموونانە قڕ بوون و نەماون. بۆیە ئەوەی ئێستا هەیە لەو جۆرانەیە کە نابێت بە مرۆڤ".

کەسێك باوەڕی بەوە هەبێت یەکەم مرۆڤ لەلایەن خوداوە بەدیهێنراوە، دەتوانێت زۆر بەئاسانی ئەم قسەیە پووچ بکاتەوە، بەوەی دەتوانێت بەو کەسە بڵێت: ئەگەر وا بێت، دەبێ جۆری ئەو مەیموونانەی لە کۆندا ژیاون و بوونە بە مرۆڤ، زۆر لەوانەی ئەمڕۆ پێشکەوتووتر بووبن، چونکە بەو پێیەی هەندێکیان بەهۆی هەندێك گۆڕانەوە بوونە بە مرۆڤ، بەڵام هەندێکی تریان نەبوونە، دەبێ ئەوانەی نەیانتوانیوە ببنە مرۆڤ زۆر دواکەوتوو و بێمێشك و بێبەهرە بووبن. باشە چۆن دەبێت وەچەی مەیموونە پێشکەوتووەکان ببڕێتەوە و نەتوانن بگەنە ئەمڕۆ؟ ئەگەر وا بوایە، دەبوایە ئەوانەی

کەمتر پێشکەوتوو بوون و نەیانتوانی ببنە مرۆڤ، وەچەیان ببڕایەوە و قڕیان تێبکەوتایە.



● هێڵکارییەکانی (ڕاما پیتیاس) کە بە پشت بەستن بە پارچە شەویلگەیەك کێشراون. ئەمەش بەرهەمێکی دیکەی هێزی خەیاڵی ئەوانەیە کە شوێن پەرەسەندن کەوتوون.

٥- داروینیستان بانگەشە بۆ ئەوە دەکەن کە سەردەمێکی گواستنەوە لە مەیموونەوە بۆ مرۆڤ هەبووە، بەڵام ئەو زانیاری و بەڵگانەی بەم دواییانە زاناکان پێی گەیشتوون، ئەوە دەسەلمێنن کە ئەم ماوەی گوێزرانەوەیە بوونی نەبووە، چونکە زیندەوەرێکی لەم چەشنە نەدۆزراوەتەوە. ئەو ئێسك و پروسکانەش کە دۆزراونەتەوە، ئەوە دەردەخەن ئافەریدەیەکی وا لەژیاندا نەبووە. سەرباری ئەوەی لەو چاخانەدا کە ئەوان دەڵێن ئەم بوونەوەرانە تێیدا ژیاون، مرۆڤ بە

مرۆڤی ژیاوه نەك بە ئاژەڵی. تەنانەت لەو چاخانەوە شوێنەواری شارستانیی وا بەجێ ماوە، کە ئێستاش کەسانێك سەرسامن بەوەی چۆن مرۆڤی ئەو دەمە توانیویەتی شتی وا دروست بکات. بۆ نموونە لەو سەردەمانەدا کتێب نووسراوە کە ڕێی تێناچێت مرۆڤێکی مەیموونی ئەوەی کردبێت. ئەی خۆ زیندەوەری تر لە بۆشاییی ئاسمانەوە نەهاتووە کردبێتی. مرۆڤ ئافەریدەیەکی هەڵبژاردەیە کە دەتوانێ بدوێت، گۆرانی بچڕێت، خۆی بپۆشێت، خانوو دروست بکات و ئامێری تازە بابەت دابهێنێت. بەهۆی ئەمانەوە تەواو جیایە لە مەیموون. کەسێك هەر ڕووکەشانە بۆی بڕوانێت ئەو جیاوازییانە نابینێت. کەسێك بێ بیرکردنەوە و وردبوونەوە بڕوانێت بۆی هەیە مەیموون بە مرۆڤ بچوێنێت. ئەگەر لەبەر وێکچوونی یەك یان هەندێك تایبەتمەندی بڵێین مرۆڤ و مەیموون لە یەك ڕیشەوە سەریان دەرهێناوە، دەبێت بە گاڵتەجاڕییەکی گەورە، چونکە ئەو کات دەتوانین بڵێین چناریش لە پەرەسەندنی مەعدەنووسەوە هاتووەتە بوون!

یەکێك لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ قسەکردنە. ئەم تایبەتمەندییەی مرۆڤ لەلایەن هیچ ئاژەڵێکەوە تەنانەت ناتوانرێت لاساییش بکرێتەوە. هەیە و نییە تووتی (بەبەغا) دەتوانێت تا ڕادەیەکی کەم لاساییی مرۆڤ بکاتەوە، بەوەی لە باریدایە چەند وشەیەك فێر ببێت و بیڵێتەوە. ئایا دەبێ یەکێك هەر لەبەر ئەمە بڵێت

مرۆڤ لە ڕەگەزی تووتییەوە هاتووە؟! نەك مرۆڤ، بگرە باڵندەكانیش بەمە پێكەنین دەیانگرێت. خۆ وتنی ئەوەی مرۆڤ لە مەیموونەوە هاتووە، هەر وەك ئەمە جێی پێكەنینە.

٦- ئەگەر ڕوانینی نەفامانە بۆ ڕووی دەرەوە بخەینە لاوە ئینجا بیر بكەینەوە، دەبینین مەیموون بە هیچ جۆرێك لە مرۆڤ ناچێت. گەر بڕوانینە خانەكانی جەستەی مەیموون كە بەردی بناغەی جەستەیانە، دەبینین بە شێوەیەكی تەواو جیا لە خانەی مرۆڤ بەدیهێنراون. لە كاتێكدا خانەكانی مرۆڤ ٤٦ كرۆمۆسۆمیان تێدایە، خانەكانی مەیموون ٤٨ كرۆمۆسۆمیان تێدایە. ئەگەر لە هەر یەكە لە مرۆڤ و مەیموون یەكی خانەیەك وەربگرین و بیبەینە تاقیگە، یەكسەر پێمان دەوترێت ئەوەیان هی مرۆڤە و ئەوەشیان هی مەیموونە. چونكە ژمارەی كرۆمۆسۆمەكانی خانە بە دەست تێوەردانی دەرەكی گۆڕانی بەسەردا نایات، لە بنجدا چەند بووبن ئێستاش هەر ئەوەندەن.



• جیاوازیی ڕێ كردنی مرۆڤ و مەیموون




● ئەم کاریکاتێرە لە ژمارەی ئەیلوولی ١٩٨٢ی گۆڤاری Discover) - دۆزینەوە) کە تایبەتە بە دۆزینەوە زانستییەکان و ملیۆنان خوێنەرەوەی هەیە- بڵاوکراوەتەوە. ئەو گۆڤارە کە هەر جارە و بە بەڵگەیەکی زانستی هەوڵی پووچەڵ کردنەوەی بیردۆزەکەی داروین دەدات، ئەم جارەش وەکو نوکتەیەك دەڵێت: ئەگەر پەرەسەندن ڕاستیش بێت ئەوە بەس داروین دەگرێتەوە.

٧- لووتی مرۆڤ باریکە و هی ئاژەڵانی دیکە پانە. ئەمەش تایبەتمەندییەکی گرنگە کە مرۆڤ و مەیموون لێك جیا دەکاتەوە.

٨- هیچ ئاژەڵێك ناتوانێت تەواو قیت بوەستێت، ئەم خەسڵەتە تایبەتە بە مرۆڤ. فراوانیی کەللەسەر و گەورەییی مێشکی مرۆڤیش، جیاکەرەوەیەکی ترە. هیچ مەیموونێك نییە لە مێشك گەورەییدا توانیبێتی شان لە شانی مرۆڤ بدات. مرۆڤ مێشکی گەورە و دەموچاوی بچووکە، هەر چی ئاژەڵانە دەموچاویان گەورەترە لە سەریان. ئاژەڵە دڕندەکانیش دەموچاویان لە گەورە بووندایە.

٩- جیاوازییەکی گرنگی تر دەست و پێیە. ئەموستەکەڵەی پێی مەیموون، هەر وەکو ئەموستەکەڵەی دەستی مرۆڤە، لە پەنجەکانی تر دابڕاوە و دەتوانێت خۆی بدات لە گشت پەنجەکانی تر.



● مرۆڤ ئافەریدەیەکی بژاردەیە، دەتوانێت بئاخفێ و جلوبەرگ بپۆشێت و داهێنانکاری بکات.

هەر بۆیە مەیموون دەتوانێت پێیەکانیشی وەك دەستەکانی بەکاربهێنێت. هەر لەبەرئەمەیە بە مەیموون دەوترێت (چوار دەستدار). ئەمە لە کاتێکدا کە پێیەکانی مرۆڤ تەنها بە کەڵکی لەسەر وەستان و ڕێ کردن دێن و، مرۆڤ ناتوانێت وەك مەیموون پێی لە جێی دەستی بەکاربهێنێت.

١٠- مەیموون پێکهاتەی ئێسکیشیان جیاوازە. بۆ نموونە قۆڵیان درێژە، پێکهاتەی ددانیشیان جیایە، کەڵبەیان زۆر گەورەیە، بەڵام کەڵبەی مرۆڤ هەمان قەبارەی ددانەکانی تری هەیە. مەیموونی (گرۆمایان) -کە داروین بە باوەگەورەی مرۆڤایەتیی دادەنێت- کەڵبەی هەر نییە! شەویلگەی مرۆڤ گۆشەی وەستاوی هەیە، کەچی لە مەیموون وا نییە.

١١- وەکو سەرجەم ئاژەڵە وشکانییەکانی تر، مەیموون پێستێکی تووکنی هەیە، بەڵام هی مرۆڤ ڕووتە.

١٢- مەیموونەکان بە گوێرەی هەستێك -کە خودا پێی داون- هەڵسوکەوت دەکەن و ژیان دەگوزەرێنن. هەر کەمێك دوای ئەوەی دێنە دونیاوە، دەگەنە ئەو ئاستەی بتوانن پێداویستییەکانیان دابین بکەن، بەڵام مرۆڤ وا نییە، پێویستیی بە ساڵانێك هەیە بۆ ئەوەی بگاتە ئەو ئاستە. دوای ئەوەی چەند ساڵێك پەروەردە دەکرێت و فێر دەکرێت، ئینجا دێتە گۆڕەپانی کار و خۆ ژیاندنەوە. هیچ ئاژەڵێك -لەنێوشیاندا مەیموون- پێویستیی بەوەندە ساڵە نییە.

١. هیچ ئاژەڵێك خاوەن بیروباوەڕ نییە، بەو واتایەی ناتوانێت باوەڕ بە هێز و بوونێك بێنێت. ئەم تایبەتمەندییە تەنها هی مرۆڤە. پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) دەفەرموێت: "ئەوەی ئەقڵی نەبێت، دینیشی نییە". مەیموونیش لە ڕیزی بوونەوەرە بێباوەڕەکاندایە. بێگومان سەرجەم بەدیهێنراوەکانی خودا یادی خودا دەکەن و بە زمانی حاڵی خۆیان دەیپەرستن، ئەوەی ئێمە مەبەستمانە بیروباوەڕی هەڵقوڵاوە لە هەست و زانستەوە. پەرستشی ڕووەك و ئاژەڵەکان بە دەستی خۆیان نییە، بەڵکو هەر لەو ڕۆژەوەی هاتوونەتە دونیا ئەو ئەرکەیان پێسپێردراوە. بەڵام مرۆڤ هەر چەندە بە شێوەیەکی وا بەدیهێنراوە کە حەوجەی باوەڕە، کەچی بەسەریدا نەسەپێنراوە. مرۆڤ بەو ژیرییەی پێی دراوە و بەو ڕۆشنبیری و

زانستەی بە دەستی دەهێنێت، دەتوانێت بگاتە پلەی باوەڕداری و بەندایەتی. لەم گۆشەنیگایەوە مەیموون کە دەیەوێت شتێك بخوات یان بخواتەوە، لەسەری پێویست نەکراوە لە حەڵاڵ و حەرام بپێچێتەوە. بەڵام مرۆڤ بەسەریدا دراوە لەوە بپێچێتەوە. ئەوان بێ مارەبڕین ژن دەهێنن، هەتاهەتایە فێری نووسین و خوێندنەوە نابن، لە ملیان بدەیت ناتوانن بە دەرزییەك دوو تەقەڵ لێبدەن، کەچی مرۆڤ دروومان و پیشەسازیی جلوبەرگی کردووەتە پیشە.

مەیموون نە لە گەردوون دەگات و نە دەتوانێت ڕاڤەی بکات. لەبەرانبەر بروسکەیەکدا، هەر ئەوەندەی لە توانادایە هەڵبێت، کەچی مرۆڤ ئێستا لە هەوڵی ئەوەدایە کارەبای لێ بەرهەم بێنێت.

مەیموون خووڕەوشت و بەهای باڵای لا نییە، لە ماف و مافپەروەری ناگات.

مرۆڤ کە بیر لە یادەوەرییەکانی دەکاتەوە هەستی دەبزوێت. بیر لە ڕابردوو دەکاتەوە و خەیاڵی داهاتوو دەکات، بەڵام لای مەیموون نە ڕابردوو هەیە نە داهاتوو، ئەوان هەر لە بیری ئەمڕۆدان.

مەیموون لە کاتی زاندا، پێویستی بە مامان نییە. کە بەچکەکەشی دێتە دونیاوە، نە پێویستی بە بێشکە و پێخەفە، نە بە خواردن بۆ سازکردن. بەم جۆرە جیاوازیی نێوان مرۆڤ و مەیموون هەر لە هاتنە دونیاوە دەست پێدەکات تاکو مردنیش بەردەوامیی دەبێت.

جیاوازیی نێوان مرۆڤ و مەیموون لە ژمارە نایەت. ئەی ئەو شتەی ئەوانەی سەرسام کردووە کە مەیموون بە مرۆڤ دەچوێنن چییە؟ توانای لاسایی کردنەوەیە لای مەیموونەکان. مەیموون لە ئاژەڵانی تر جوانتر لاساییی هەندێ جووڵە و هەڵسوکەوتی مرۆڤ دەکاتەوە، بەلام ئەم لاسایی کردنەوەیە بەهەستەوە نییە، بەڵکو خۆشیان نازانن چی دەکەن.



ئەگەر بەهۆی هەندێك لێکچوونی سادەوە بوترێت مرۆڤ لە ڕەگەزی مەیموونەوە هاتووە -وەك ئەوەی شوێنکەوتووانی پەرەسەندن دەیڵێن- هەڵەیەکی گەورەیە. چونکە ئەگەر بەوە بێت دەتوانین چەندین لێکچوون لەنێوان پشیلە و فیل، مشك و حوشتر بدۆزینەوە.

ئایا دەبێت بە بیانووی ئەوەی لە چەند ڕوویەکەوە لە یەك دەچن، بڵێین فیل لە پەرەسەندنی پشیلەوە، حوشتریش لە پەرەسەندنی مشکەوە پەیدا بووە؟

***

که قسه هاته سەر ئەمە، محەمەدی فەیلەسووف خۆی پێنەگیرا و وتی:

– مامۆستا! ئەی کە وایە لەبەرچی لەگەڵ ئەو هەموو جیاوازییە لە بەدیهێنران و بونیادیان دەکرێن بەیەك؟

– محەمەد! ئەوە زۆر هۆی هەیە، بەڵام وەك لە سەرەتاشەوە ئاماژەمان پێدا، دەیانەوێت بە وتنی ئەوەی لە مەیموونەوە هاتووە، لە پلەوپایەی گەورەترین و بالاترین ئافەریدە کە مرۆڤە کەم بکەنەوە.

– بەڵام مامۆستا! ئایا ئەوانەی ئەم کارە دەکەن هەر مرۆڤ نین؟! باشە بۆچی دەیانەوێت مرۆڤ سووك بکەن؟

– ئەوانەی دەیانەوێت مرۆڤ بێننە ئاستی ئاژەڵ، ئەوانەن حەز بە بەرزی و بالایی ناکەن و شەرمی لێدەکەن. ئەما هەندێك کەس گرێی دەروونیی هەیە بەرانبەر بەرزی، ناوێرن سەرکەونە سەر تەلارە بەرزەکان، کە سەریش دەکەون ناوێرن سەیری خوارەوە بکەن، یان ناوێرن سواری فڕۆکە ببن.

ئەو کەسانە لەبەر ئەو بەرزییە مەعنەوییەی مرۆڤ هەیەتی ترسێك لە دڵ و دەروونیاندا هەیە.

● شــــته زۆر ســــــادەکانی گەردوونیش بـە زانستێکی بێسنوور بەرنامەیان بۆ دارێژراوە، هـەر بۆیـە ئامــاژە بــۆ خــودا دەکــەن نــەك پەرەســەندن. بـۆ نموونــە: لـە هـەر خانەیـەکی مرۆڤـدا ٤٦ کرۆمۆسـۆم هەیە کە لە هەر یەکەیاندا بەقەد ٤٦ ملیۆن بەرگ ئەنسکلۆپیدیا، کە هـەر یەکـەیان بیست هـەزار لاپـەڕە بێـت زانیاری تۆمار کراوە.



زۆربەی ئەو کەسانە تایبەتمەندییـەکانی مرۆڤایـەتییان لـە دەسـت داوە، هەڵسـوکەوتیان زۆر لــە ئــاژەڵ نزیـك بوونەتــەوە، تەنانــەت هەندێکیان ئـاژەڵ ئاسا حسێب بـۆ یاسـا و میللـەت و بـاوەڕ و ئـاین ناکـەن. بـۆ ئـەوەی بتـوانن ڕاڤـەی ئـەم شـێوازەی ژیانیـان بکـەن و پاساوی بۆ بدۆزنەوە، دێن دەڵێن مرۆڤـیش جـۆرە ئاژەڵێکـە، چونکە کە توانییان ئەوە بڵێن، دڵیان دادەکەوێت و چیدی کەس سەرکۆنەیان ناکات و ناڵێت: سەیر سەیر چ مرۆگەلێکن!

– بەڵام مامۆستا! چۆن هەقی ئەوەیان هەیە لە بەهای مرۆڤ کـەم بکەنەوە و بیهێننە ڕیزی ئاژەڵان؟ بۆچی کـە ئـەوان دەیانـەوێت بـڕ و بیـانوو بـۆ خۆیـان بێننــەوە، دەبێـت ئێمـە دەسـت لـە مرۆڤــایەتی بکێشینەوە؟

– نەخێر محەمەد! نابێت دەست لە مرۆڤایەتی بکێشینەوە. دەبێت بە هەڵسوکەوتمان، بە گفتار و بیروباوەڕ و بەندایەتیمان، پێیان پیشان بدەین کە مرۆڤایەتی هەر ماوە. کە وامان کرد ئەوکات بە زمانی حاڵ وەڵامی ئەوانەمان داوەتەوە کە دەیانەوێت بە ئاژەڵمان بچوێنن.




بەر لەوەی کۆتایی بە باس و خواسەکە بێنین، وا دیارە یەکێك قسەی پێیە. بەڵێ، بەم پرسیارە بە شێوەیەکی کاتی دوایی بە مەسەلەی لە مەیموونەوە هاتن دێنین.

– چاودێر! قسە بکە.

– مامۆستا! لە گەلێك کتێب و ئەنسکلۆپیدیادا وێنەگەلێکم بینیوە، یەکەمیان مەیموونێك بووە و ئەوانی تر یەك لە دوای یەك شێوەی لە مرۆڤ چوونیان زیادی کردووە. لە ژێریشیاندا نووسراوە: یەکەم مرۆڤ مەیموونێکی لەم چەشنە بووە و دواتر وردە وردە بووە بەمەی ئێستا، بەڵام جەنابتان لەم وانەیەدا چەواشەیی ئەوەتان ڕوون کردەوە. باشە کێشانی ئەم هەموو وێنەیە لە پای چی؟ ئینجا بۆچی ئەم هەموو کتێبە پشتڕاست و بڵاوی دەکەنەوە.

– زۆربەی ئەو کتێبانە زانستی نین. هەندێکیان هەر وەك ئەوانەی ڕووکەشانە بۆ مەسەلەکە دەڕوانن، بێ هیچ لێکۆڵینەوەیەك دانراون،

هەندێکیشیان سەرچاوەی بیانین و بە ئامانجی سەر لێشێواندن و لە خشتە بردنمان نووسراون. نەك هەر ئیسلام بە تەنها، بەڵکو ئایینی مەسیحییەت و یەهوودییەتیش ئەوە دەڵێن کە مرۆڤ لە حەزرەتی ئادەمەوە، نەك مەیموونەوە هاتووە. لەلایەن هەندێك لەو بێباوەڕانەی شەڕیان دژ بەم سێ ئاینەی خودا ڕاگەیاندووە، ڕاستییەکان بە ئەنقەست ئاوەژوو دەکرێنەوە.

– باشە، مامۆستا! ئەی ئەوانەی باوەڕیان بەوە هەیە کە حەزرەتی ئادەم یەکەم مرۆڤە، بۆچی بیروباوەڕی خۆیان نانووسنەوە؟

– دەینووسنەوە، دەینووسنەوە... وەلێ ئەوە نییە دەڵێت: "ئەو بەردەی نەزان دەیخاتە گۆمەوە، بە سەد زانا نایاتە دەرەوە". لەسەر ئەم بابەتە چەندین بەرهەم بڵاوکراوەتەوە، لە هەر چوار لای دونیاوە چەندین لێکۆڵینەوە ئەنجام دراوە و کتێبی زانستی نووسراوە، بەڵام لەبەرئەوەی هێزی پڕوپاگەندەی داروینیستان زۆر بەکارتر بووە، دەنگی ئەمانە تازە بە تازە وا خەریکە لای خۆمان دەبیسترێ. لەم دواییە لای خۆشمان چەند کتێبێك لەم بارەیەوە بڵاوکراونەتەوە.

لە هەر لایەکی دونیا دەیگریت، بڕیاری ئەوە دەدرێت بیروڕاکانی داروین وەکو زانستێك لە قوتابخانەکاندا بێتە خوێندن. ئەمریکا لەمەدا بووە بە پێشەنگ. بەم دواییانە لە یۆنانیش، ویستیان وا بکەن لە دواناوەندیدا بوترێتەوە، ئەوەش چەند ڕووداوێکی لێکەوتەوە.

***

لەدواوە گوێم لە دەنگێك بوو:

– لێمان دا!

– ئەوە چییە عەلی؟! ئەڵێی زۆر لە باسەكە بێزار بوویت؟

– دڵخۆشم كە تەواو بوو...

– ئەم دڵخۆشییە بۆ؟!

– دڵخۆشم بەوەی بۆم ساغ بووەوە كە لە مەیموونەوە نەهاتووم.

– عەلی بەڵگەیەكی تری بۆ ئاشكرا كردین لەسەر ئەوەی كە لە مەیموونەوە نەهاتووین، بۆ ئەوەی بۆمان ڕوون ببێتەوە شتێك كە دەربارەی مرۆڤ دەوترێت ڕاستە یان نا، دەبێت بەر لە هەر شتێك لە ئەقڵ و زانست بپرسین، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت لە دڵ و دەروونمان بپرسین، ئێمە خاوەنی هەست و سۆزین، "ئێمە لە مەیموونەوە هاتووین" چ مانایەكی هەیە؟ ئایا مانای ئەوە نییە باپیرەی باپیرەی باپیرەی... باپیرەمان مەیموون بووە؟ كە بە مێژوودا ڕۆدەچین دەگەینە سەردەمێكی وا مەیموونێك بابە گەورەمانە. ویژدانی كێ ئەمەی قبوڵە؟ كێ كەیفی پێدێتەوە و دەڵێت: ئۆخەی سەد پشت هەزار پشت لەمەوبەرم مەیموون بووە؟

كەسێك نەبوو دەست هەڵبڕێ.

– ئەمەش بەڵگەیەكی هەستەوەرانەی ترە لەسەر ئەوەی لە مەیموونەوە نەهاتووین. ئەی ئەگەر بڵێین حەزرەتی ئادەم

بابەگەورەمان و یەکەم مرۆڤە، لەگەڵ هەست و ویژدانمان یەک ناياتەوە؟

کەواتە خەڵکی هەر لە سەرەتاشەوە کورِ و کچی مرۆڤ بوونە. با بەسووکی لە خۆمان نەرِوانین.

با لە کۆتاییدا ئەوەش بڵێم، مرۆڤ هەندێك جار ئیشی سەیر سەیر دەکات. ئەگەر بێن و یەکێك بە مەیموون بچوێنن لێتان زویر دەبێت، بەڵام هەر ئەو کەسە رِازییە بەوەی چەند پشتێك لەمەوبەری بکرێت بە مەیموون! ئەمە هەڵسوکەوتێکی ژیرانە نییە. کاتێك بەوە تووڕە دەبین یەکێك سووکایەتیمان پێبکات، بۆچی خۆمان سووکایەتی بە خۆمان دەکەین؟



## ساڵیادی میعراج

## چیمان بەبیر دێنێتەوە؟

هەفتەیەکمان مابوو بگەینە ساڵیادی میعراج. لە چەند پۆلێك ئـەم باسەم کردەوە. بەهۆی عەودالّیی زۆریان کە لە سـەرەتای گەنجێتیـدا بـوون، باسـەکە گـەلێك درێـژەی کێشـا. بەرزبوونـەوەی پێغەمبـەر (دروودی خودای لێبێـت) بـۆ ئاسمانـەکان و تەنانـەت زۆر ئـەولاتریش –کە بـە خەیاڵماندا نایات– زۆر لایان سـەیر بـوو. قوتابییـەك داوای مۆڵەتی قسەکردنی کرد و وتی:

– مامۆستا ! پێشـتر باسـت لـەوە کردبـوو، هـەر پێغەمبـەرەی لـە هونەرێکـدا پێشـەنگ بـووە. ئایـا دەتـوانین بـە لەبەرچـاو گرتنـی

موعجیزەی بەرزبوونەوەی پێغەمبەرمان(درودی خودای لێبێت) بە پێشەنگی کەشتیوانە ئاسمانییەکان دابنێین؟

- بێگومان بەڵێ. بەڵام بەو مەرجەی ددان بەوەدا بنێین کە ئەو بەرزییەی ئەو - چ لە ڕووی ماددی و چ لە ڕووی مەعنەوییەوە- پێی گەیشت، هیچ کەشتیوانێك ناتوانێت بیگاتێ...

دیار بوو محەمەدی فەیلەسووف دیسان ئۆقرەی لێهەڵگیرابوو، لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد.

وتم:

- محەمەد! قسە بکە.

- مامۆستا! پێغەمبەرمان (درودی خودای لێبێت) بەم موعجیزەیەی ڕێی ئاسمانی کردووەتەوە. بە میعراج بۆ مرۆڤایەتیی سەلماندووە کە سەرکەوتن بەرەو ئاسمان مەحاڵ نییە. بەڵام ئەوە جێی داخە کە تا ئێستا هەموو ئەوانەی هەوڵی چوونە ئاسمانیان داوە و ئەوانەش کە فڕۆکەیان داهێناوە، هەر فەلە بوونە. هەق وا بوو موسوڵمانان بەمانە هەڵسابان، چونکە باوەڕیان بە میعراج هەیە و ساڵانە یادی دەکەنەوە.

چەند قوتابییەك بەرهەڵستیی قسەکانی محەمەدیان دەکرد. کەمال لە ڕێی بەرگێکی قەبەی ئەنسکلۆپیدیا کە بە دەستییەوە بوو، دەیویست هەڵەیەکی محەمەد ڕاست بکاتەوە:

– محەمەد باسی ئەوەی کرد کە هەر فەلەکان فڕۆکەیان دروست کردووە و هەوڵی چوونە ئاسمانیان داوە، بەڵام وا نییە، یەکەم کەس کە هەوڵی فرینی داوە زانایەکی موسوڵمانی تورك بووە بە ناوی (هازەرفەن ئەحمەد چەلەبی)، کە لە سەدەی حەڤدەهەم و لە سەردەمی سوڵتان مورادی چوارەمدا ژیاوە، لە (قوللەی گەڵەتە)وە تا (ئەسکیدار) فڕیوە.



یەکەمین هەوڵەکانی چوونە ئاسمانیش هەر لەلایەن موسوڵمانانەوە ئەنجام دراوە. ئێستا ناتوانم ئاماژە بە ناوەکانیان بدەم، بەڵام چەندین زانای فەلەکناسی لەناو موسوڵمانان هەڵکەوتووە.

– باشە، کەمال! مادام وایە با ئەرکێکت پێ بسپێرم، بۆ وانەی داهاتوو ناوی ئەو زانا موسوڵمانە تورکانەی بە فەلەکناسییەوە خەریك بوونە، لەگەڵ هەوڵەکانیان لەو بوارەدا کۆبکەرەوە تا لە پۆلدا باسی بکەیت.

چاودێری پۆل وتی:

– مامۆستا! باسی میعراجت دەکرد...

– بەڵێ... میعراج ڕووداوێکی گەورەیە. موعجیزەیەکی بێ هاوشێوەی پێغەمبەرمانە (دروودی خودای لێبێت). شەوێکیان لە خەو

بێدار دەبێتەوە و بە هێزێك -كە خودا پێی دەبەخشێت- لە مەككەوە دەچێتە قودس. دوای ئەوەی لە مزگەوتی ئەقسا نوێژ دەكات، بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوە. ئەوەندە بەرز دەبێتەوە دەگاتە شوێنێك جوبرەئیل -كە لەو گەشتەدا هاورێیەتیی كردووە- پێی دەڵێت: "**من ناتوانم لەوە زیاتر بێمە پێش**". هەڵبەتە زانینی سەرجەمی هەقیقەتەكانی ئەو جیهانە، بۆ ئێمەی مرۆڤ مەحاڵە. ئەو زانیارییەی لەو بارەیەوە هەمانە لە رێی فەرموودەكانی پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) و قورئانەوەیە. سوورەتی (الأسراء) كە بە مانای (شەورەوی) دێت، باسی ئەم موعجیزەیەمان بۆ دەكات.

پێغەمبەرمان (درودی خودای لێبێت) لە ماوەی ئەو گەشتەیدا، كە بۆ ئەو دیوی ئەو دیوەكان كردی، چەندین شتی وای بینیوە كە مەحاڵە ئێمەومانان بە چاوی دونیامانەوە بیانبینین، وەكو بەهەشت و دۆزەخ. تەنانەت لەگەڵ خودای گەورە گفتوگۆی كردووە. پێنج فەرزەی نوێژیش، هەر لە میعراجدا فەرمانی لەسەر دراوە.

خۆشەویست (درودی خودای لێبێت) دەفەرمووێت: "**نوێژ میعراجی موسوڵمانە**"، كەواتە بەرزبوونەوەی ئێمە بۆ لای خودای گەورە لە رێی نوێژەوە دێتە دی. میعراجی پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) هەم بە گیان و هەمیش بە جەستە بووە، بۆ ئێمەش نوێژ -كە میعراجمانە- لە پیسیی ماددی و مەعنەویی پاكمان دەكاتەوە، بە مەرجێك بەو باوەڕەوە ئەنجامی بدەین كە لە دیداری خوداداین.

# هەڵەیەکی گەورە

(ئەسڵی) داوای مۆڵەتی قسە کردنی کرد. بەوەی زۆر بەجۆشەوە دەستی هەڵبڕیبوو، پێدەچوو قسەی هەست بزوێنی پێبێت:

– قسە بکە، ئەسڵی!

– مامۆستا! خاوەن یادێکی ئاوا گەورەین، بەڵام زۆربەمان لێی بێئاگاین. کەسانێك هەن دەڵێن یادێکی پیرۆزە، بەڵام نازانن ساڵیادی چییە... جێگەی داخە هەوڵێکی وا نادرێت بۆ یاد کردنەوەی ئەم شەوە جێگەی باس بێت.

عەلی هەمان ڕای ئەسڵیی هەبوو. زیاتریش وتی:

– موسوڵمانێکی گەلێك زۆر هەیە یادە پیرۆزەکانی ئاینەکەی خۆی پشت گوێ دەخات و یادی ناکاتەوە، سەرباری ئەوەش لاسایی دابونەریتی فەلەکان دەکاتەوە. بەهۆی ئەو نووسینانە نەبێت کە لەسەر جامی دوکانی شیرینەمەنییەکان هەڵدەواسرێت وەکو "یادی....تان پیرۆز" یان "ئەمڕۆ یادی میعراجە"، یادە پیرۆزەکان لەیاد دەچن، بەڵام کەس نییە سەری ساڵی لە بیر بچێت! بگرە زۆر کەس چەند ڕۆژ لەوەوپێشیش ئامادەکاریی بۆ دەکات، لەو ڕۆژەشدا کەش و هەوای جەژن ساز دەکات.

– بەڵێ، عەلی ڕاست دەکات. کاتێک بەپێی فەرمانەکانی ئایینی خۆمان ناجووڵێینەوە و، لەگەڵ ئەوەشدا دەکەوینە بەجێ گەیاندنی فەرمانەکانی ئاینی مەسیحی، هەڵەیەکی گەورەمان کردووە. کێ دەتوانێت پێمان بڵێت بۆچی موسوڵمانان دەکەونە ئەم هەڵە گەورەیەوە؟

زیاتر لە نیوەی پۆل دەستی بەرز کردبووەوە. ڕێم بە ئۆیا دا بدوێت.

– بەر لە هەر شتێك بەهۆی نەفامییانەوەیە، ئاگایان لێ نییە چی دەکەن. بێ ئەوەی بزانن ڕابواردنی سەری ساڵ و هەندێ شتی تر کە تایبەتە بەو یادەوە – وەکو خواردنی قەلی سەرساڵ – چی دەگەیەنێت، دەیکەن. فەلەکان یادی ئەو ڕۆژە دەکەنەوە، لەبەرئەوەی ساڵیادی لە دایك بوونی حەزرەتی عیسایە. وا هەست دەکەم زۆربەی موسوڵمانان لەوە بێئاگان. وەك بڵێی لەبەرئەوەی بەتاسەوە چاوەڕێی هاتنی ساڵێکی نوێ دەکەن، ئاگایان لەو شتانە نامێنێت.


● قەلی سەرساڵ

دوا بە دوای ئەمە فکرەکان یەك بە دوای یەکدا هاتن. یەکێك ڕەخنەی لەم قسانە هەبوو:

– چما کەسێك هەیە نەزانێت سەری ساڵ یادی لە دایك بوونی حەزرەتی عیسایە؟! هەموو کەسێك کە یادی ئەو ڕۆژە دەکاتەوە زۆر بەچاکی دەزانێت یادی ئەو پێغەمبەرەیە (دروودی خوای لەسەر بێ).

چاودێری پۆل لێی هاتە وەڵام:

– حەزرەتی عیساش یەك لەو پێغەمبەرە گەورانەی خودایە کە پەیامی پێ هەناردوون. مەگەر یاد کردنەوەی لە دایك بوونی ئەو زاتە گوناهە؟

عەلییش وەڵامی (بایکان)ی دایەوە:

– ئایا ئەوەی لە سەری ساڵدا دەکرێت، یاد کردنەوەی حەزرەتی عیسایە؟ یەعنی گیانی حەزرەتی عیسا بە زۆر خواردن و عەرەق




● ئەم کاریکاتێرە گوزارشت لە حاڵی لاسایی کەرەوە نەفامەکان دەکات.

خواردنەوە و خۆبادان شاد دەكرێـت؟! بـە ڕای مـن ئـەوەی فەلـەكان دەیكەن یادكردنەوە نییە.

وتم:

– خەریكـە گفتوگۆكـە درێـژە بكێشـێت و باسـە سـەرەكییەكەی خۆمان لە بیر بچێتەوە.

ئەوەی وتتان زۆری ڕاست بوو. كاتێك موسوڵمانان لاسـایی هەنـدێ دابونەریتی گاورەكان دەكەنـەوە، ڕەنگـە بـەهۆی نەزانییانـەوە بێـت. دەشـگونجێت بـەهۆی سـەر دەرنەچـوونیان لـە ئایینەكـەی خۆیـان و بیروباوەڕەكانی تر بەم هەڵانەوە بگلێن، بـەڵام زیـاتر بـەهۆی لاوازیـی باوەڕیانەوەیە. موسوڵمانێك خاوەن باوەڕێكی بەهێز بێت و بـەردەوام بێت لەسەر پەرستشەكانی ناچێت لاسایی شـوێنكەوتووانی ئاینـەكانی تر بكاتەوە.





● خواردن و خواردنەوەی پیرۆز بەشێكن لە ڕێوڕەسمی ئایینی، هەنـدێك لـە ڕۆشنبیرانی ئێمە لە گاورەكان پتر حەزیان لەم جۆرە ڕێوڕەسمانەیە.

ڕۆژنامەکان لەسەر ئەو شاعیر و شانۆکار و نیگارکێش و مامۆستایانەی زانکۆیان نووسیبوو کە بەشدار بووبوون لە ڕێوڕەسمێك لە کلێسای (ساینت ئەنتۆین) لە (بێی ئۆغلوو). ئەمانەن کەسە ڕۆشنبیرەکانی ولات، بەلام لەبەرئەوەی ڕووناکیی ئیسلام نەکەوتووەتە دلیانەوە، کلێساکانیان پڕ کردووەتەوە. قەشەش داوای کردبوو موسولمانەکان دەست بۆ خواردن و خواردنەوە پیرۆزەکان نەبەن، چونکە تەنها بەشی گاورەکان ئامادە کراوە!

ئەم ڕووداوە ئەوە پیشان دەدات کە ژیان وەك ئەوەی ئاینەکەمان دەیەوێت چەند بوەستێتە سەر زانین ئەوەندە و بگرە زیاتریش دەوەستێتە سەر باوەڕ... مرۆڤ چۆن دەبێت بە باوەڕدار؟ ئەوە بەندە بە پێگەیشتن. ئەگەر بێت و ئێوە لە ئێستاوە نەریتە ئیسلامییەکان بەتەواوی فێر بن، هەر بەوەندەش نەوەستن، بەلکو خۆتان ڕابهێنن لەسەر پەیڕەوکردنی، ناکەونە هەلەی واوە.

دەبێت بزانن کە ئێستا ئێوە لە تەمەنی فێربوون و لێڕاهاتنندان.

عەلی دووبارە دەیویست قسە بکاتەوە، گومانی تێدا نەبوو کە دیسان ڕەخنەی هەیە:

– مامۆستا! ئەوانەی کە بۆ ڕێوڕەسمی ئاینیی سەری سال چووبوون بۆ کلێسا، تۆ بە ڕۆشنبیر ناوت بردن. ئایا ئەمانە ڕۆشنبیرن؟ خۆ ئەگەر ڕۆشنبیریش بن، ئایا بە ڕۆشنبیری ئێمە حسێبن؟

– عەلی باسوخواسەکەمانی بەتەواوی پەرش و بڵاوکرد. با ئەوەش بڵێم: ئەمانە بە ڕۆشنبیر دابنێین و دانەنێین، هەر کوڕی ئەم گەلەن. لە ڕووی پێگەیشتنەوە کەسانێکی نەگبەتن، بە زانیاریی دوور لە باوەڕ و ئاین و بگرە دژیش پەروەردە کراون. لەم ڕووەوە ناخیان ڕۆشن نییە. پێویستە بەپێی توانا هەوڵی ڕۆشنبیر کردنیان بدرێت. چوونیان بۆ کڵێسا ئەوە دەگەیەنێت کە بە دوای شتێکدا وێڵن. هەق وایە ئەو حاڵەی ئەوان دەرسێك بێت بۆ ئێوە و پەندی لێوەربگرن. پێویستە بەزەییمان بە حاڵی خۆماندا بێتەوە کە بۆچی مرۆڤە خوێندەوارەکانمان ئاوا لە ڕەگ و ڕیشەوە دەرهێنراون.

## چۆن شەو و ڕۆژە پیرۆزەکان بەرز ڕابگرین؟

ئەسلی وتی:

– مامۆستا! هێندەی نەماوە زەنگ لێبدات کەچی هێشتا نەمانزانی چۆن یادی شەوی میعراج بکەینەوە.

– ڕاست دەکەیت... دوای ئەم پێشەکییە دوور و درێژە، ئینجا با بێینەوە سەر ئەوەی چۆن ئەم یادە بەرز ڕابگرین...

جارێ بەر لە هەر شتێك دەبێت بەشەوق و زەوقەوە پێشوازی لەو ساڵڕۆژە بکەین. گەورەکان دیاری پێشکەشی بچووکەکان بکەن و بەم جۆرە منداڵەکانیش دڵخۆش بکرێن. دەبێت گرنگی بە نوێژ بدەین

-که دیارییەکی میعراجه- تا بکرێ لە مزگەوت و بەکۆمەڵ بکرێن. قورئان بخوێنین، ئەوانەی کە نازانن بیخوێننەوە با لەو ڕۆژەوە دەست بدەنە فێر بوونی. مەولوود خوێندنەوە و موناجات، لەو نەریتە جوانانەمانن کە ئەو شەوانە زیندوو دەکەنەوە. با گوێ لە وتاری ئاینی بگرین، پیرۆزبایی لە موسوڵمانان بکەین. با پیرۆزبایی لە یەك کردن لەو شەو و ڕۆژە پیرۆزانەدا بکەینە نەریت. کە پیرۆزبایی لە یەکێك دەکەین و لەو یادە ئاگاداری دەکەینەوە، ئەوسا یەکێك لە بنەماکانی برایی ئیسلامیمان بەجێ گەیاندووە.

خاڵێکی تری گرنگ ئەوەیە، ڕۆژەکەی بەڕۆژوو ببین. ڕۆژوو یەکێکە لە پێنج پایەکەی ئیسلام و بەندایەتییەکە کە خودا زۆر خۆشیی لێدێت. ئەگەر چی هەندێك جار گران دێتە بەر چاو، بەڵام پەرستشێکە کە نەك هەر گەورەکان بەڵکو زارۆکانیش حەزیان لێیەتی، وا نییە؟ پێم بڵێن بزانم لە چەند ساڵییەوە دەستتان بە ڕۆژووگرتن کردووە؟

دەرکەوت زۆربەیان لە دە ساڵی بە خوارەوە گرتوویانە، تەنانەت عەلی کە تەمەنی نۆ ساڵان بووە، دایکی بۆ پارشێو هەڵی نەساندووە، لەسەر ئەوە زۆر لێی تووڕە بووە و بگرە بۆ ماوەیەکیش لەگەڵی دووشك بووە و نەیدواندووە... ئەوانی تریش یادگاریی لەو جۆرەیان هەبوو.

- کە وا بێت ئێستا کە گەنجانێکی بەخۆ و لەشساغن، ڕۆژوو گرتن لاتان هیچ زەحمەتییەکی نییە.

کە ڕۆژی میعراج هات خاوەنی حانووتی قوتابخانەکەمان تا بڵێی خەمبار بوو، چونکە ئەو ڕۆژە قازانجی هاتبووە نیوە.

ئێوارەش جگەرگۆشە نوورانییەکانم، لە مزگەوت ڕیزیان بەستبوو. ئەو ساڵە یادی میعراج خۆشییەکی جیا لە ساڵانی ڕابردووی لە ناخمدا جێهێشت.

کە نوێژ دوایی هات و نزا و پاڕانەوە دەستی پێکرد چوومە ڕیزی دواوە، لەوێوە دەمبینی کە ئەو دڵە سافە نەوجەوانانە چۆن بۆ پەروەردگار ئاوەڵا بوونە. ئای چەندە دڵسۆز بوون! چاوەکانم پڕ بوون لە فرمێسك، بۆ ئەوەی بەم حاڵەوە نەمبینن هەر کە نزا و پاڕانەوە تەواو بوو، زوو ئەوێم بەجێهێشت.





## بەڕۆژوو بوون

## برسێتییەکی خۆش و شادی بەخش

لە بەیانیی یادی میعراجدا، هەر کە پێم نایە قوتابخانەوە پۆلێك قوتابی لە پێشوازیمدا بوون:

– مامۆستا ! بە نیاز بووین دوای نوێژی شێوان هەندێك پرسیارت لێبکەین، بەلاّم نەمانبینییتەوە، وا دیارە زوو لە مزگەوت دەرچوویتە.

– ئەرێ وەڵلاّ! هەر کە نزا و پاڕانەوە کۆتایی پێ هات هەڵسام. بزانم چ پرسیارێکتان هەبوو؟

- زۆربەمان دوێنێ بە ڕۆژەکەی بەڕۆژوو بووین، شەوەکەشی لە مزگەوت بووین و زۆریش درەنگ نوستین. هەندێك لە هاوڕێیان -وێڕای ئەوەی بۆ پارشێویش بەخەبەر نەهاتبوون- بەڕۆژوو بووبوون. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هیچ هەستمان بە ماندوو بوون و زەحمەت نەکرد، بەڵکو بەپێچەوانەوە برسێتییەکی خۆش و بەتام بوو. تا ئێستا کەم ڕۆژی وا خۆشمان بینیوە. سەرمان سوڕماوە کە چۆن بە خواردن و خەوتنێکی کەم ڕۆژێکی ئاوا خۆشمان بەسەر برد.

عەلی کە ئەمانەی دەوت ڕووی لە یەشار کردبوو -کە ژمارەی پێوانەیی لە قەڵەوی لە پۆلەکەدا شکاندبوو. ئەویش بەپێکەنینەوە وتی:

- هەر چەندە هەستم بە ماندوو بوون کرد، بەڵام هەر بەڕۆژوو بووم تەنانەت بەبێ پارشێویش.

دواتر دایکی یەشار هات بۆ پرسینی حاڵی کوڕەکەی. لە میانەی وتەکانیدا ئەمانەی وت:

- یەشار هەر وەك بە قەڵەوییەکەیدا دیارە زۆر خۆرە. ژەمێك نانی دێر بێ، قیامەتمان بەسەردا دێنێ. بۆ ساتێکیش دان بە خۆیدا ناگرێت. کە وتی بەڕۆژوو دەبم باوەڕم نەکرد. وتم ڕەنگە پاشگەز ببێتەوە، بۆیە بۆ پارشێو هەڵم نەساند، بەڵام ئەو هەر بەڕۆژوو بوو و تا ئێوارەش نەیشکاند.

هەر وەکو جارەکانی پێشتر ئەم جارەش ڕوون بووەوە کە ڕۆژوو پەرستشێکە -لای گەنجان و تەنانەت زارۆیانیش- زۆر خۆشەویستە.

بۆ ساغ کردنەوەی زیاتری ئەمە وانەیەکمان تایبەت کرد بە باسوخواسی ئەوەی بەڕۆژوو بوون چی دەگەیەنێت و سوودەکانی چین.

***


- پۆلەکانمان تەنگن، بۆیە تەنها قوتابیی لاواز وەردەگرین..

هەر وەکو گشت ئەو پەرستشانەی تر کە خودا فەرمانی بەسەردا داوین، بەڕۆژوو بوونیش سوود و قازانجی زۆری هەیە. دڵنیاین لەگەڵ پێشکەوتنی زانستیشدا سوودگەلێکی تری کە تا ئێستا پەییان پێ نەبراوە دەردەکەون. گومانی تێدا نییە ڕۆژوو بەندایەتییەکە بۆ قەرزدانەوە بە خودا. لەبەرئەوەی زانینی سوودە تەندروستییەکانی دەبێتە هۆی ئەوەی پتر لامان خۆشەویست بێت بەکورتی لێیان دەدوێین:

بەسوودیی ڕۆژوو بۆ لەشساغی، لەلایەن هەوڵە تاقیگەییەکانی ئەمڕۆشەوە دەسەلمێنرێن. ئەوانەی کە موسوڵمان نین لەژێر ناوی ڕێجیم و پارێز لە پێناوی لەشساغیدا ڕۆژوو دەگرن. پارێز هەر لە دێر زەمانەوە وەکو چارەسەری نەخۆشی بەکارهێنراوە. هیپۆکرات کە بە

باوکی زانستی پزیشکی دێتە ئەژمار و ٣٦٠ ساڵ بەر لە زایین لە تەمەنی سەد ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، پارێزی وەك گرنگترین ڕێگە چارە بەکاردەهێنا. لە سەرەمەرگدا هاوڕێکانی بە چاوی پڕ ئەسرینەوە دەورەیان دابوو، یەك لەوان لێی پرسی:

– هیپۆکراپ، ئەی باوکی بەسۆزی مرۆڤایەتی! دوای خۆت بە چ حەکیمێك (دکتۆرێك)مان دەسپێریت؟

هیپۆکراپ هەوڵی دا لەنێو ئەو پێخەفەی دوا ساتەکانی ژیانی تێدا گوزەراند، خۆی قیت بکاتەوە و وتی:

– ئەو حەکیمەی پێیتان دەسپێرم پارێزە.

***



ئەو پارێزەی پزیشکانی سەردەمیش وەکو چارەسەری دەیدەن، جۆرێکە لە سنووردار کردن و کەم کردنەوەی خواردن و خواردنەوە. ئەوەی پزیشك بڵێت: "مەخۆ" نایخۆین و ئەوەی بیڵێ"مەیخۆرەوە" نایخۆینەوە.

ڕۆژووش هۆکارێکی لەشساغییە و پارێزێکی یەك مانگیی شیفاهێنە کە خودا فەرمانی لەسەر داوە. ئەوەی ئامادە نەبێت ئەو پارێزە یەك مانگییە بکات، ڕەنگە ناچار

بێت تا مردن دەست بە پارێزی پزیشکانەوە بگرێت. ئەوەی بەزۆر تێدەپەستێت نەخۆشی بەربینگی دەگرێت. لەگەڵ ئەوەشدا بە زۆرخۆر ناوی دەڕوات و لەپێش چاوی خەڵکی سووك دەبێت. لە قورئانی پیرۆزیشدا خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿**كُلُوا وَ اشْرَبُوا وَ لاَ تُسْرِفُوا**﴾ واتە: «**بخۆن و بخۆنەوە، بەلام زیادەڕەوی مەکەن**». گشت پێغەمبەر و پیاوچاکانیش ئامۆژگارییەکی هاوبەشیان هەیە:

"**کەم بخۆ، کەم بخەوە، کەم بڵێ...**"

***

هەر بە وتنیش نەوەستاون، بەڵکو بەدرێژایی ژیانیان ئەمانەیان بەرجەستە کردووە. مەگەر کەسێکی گەورە هەیە بە زۆرخۆری و تێرنەخۆری ناوی دەرکردبێت؟ بەدرێژایی مێژوو کەسێکی وا نادۆزیتەوە. سەرجەمی ئەو کەسە مەزنانەی بوونەتە پێشەنگ و نموونە بۆ خەڵکی کەسانێك بوونە کەمیان خواردووە و کەمیان خواردووەتەوە، کەم نوستوونە و کەم دواون.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لێبێت) دەفەرمووێت:

"**زیانبەخشترین دەفر مرۆڤ پڕی بکات گەدەیە**".

ئیبن سینای کەڵەزانا و پزیشکی موسوڵمانی تورك کە لەسەرتاپای دونیا ڕێزی لێدەنرێت، دەڵێت: "**سەرچاوەی گشت نەخۆشییەك خواردن و خواردنەوەیە**".

هەر لەم ڕوانگەیەوەیە کە (سەنەجا)ی فەیلەسووف وتوویەتی:

"گەر دەتانەوێت ژمارەی نەخۆشییەکان بزانن، جۆری خواردنەکان بژمێرن".

***



تۆ بڵێی بۆچی زۆرخۆری ببێتە هۆی نەخۆشی؟ بۆ ئەوەی لەمە بگەین دەبێ بزانین خۆراك خواردن چییە و جەستەی مرۆڤ چۆن بەم کارە هەڵدەستێت. ئەم کردارە ئەوەندە سادە و ساکار نییە، وەك ئەوەی ئێمە لە دوو وشەدا کۆی دەکەینەوە و دەڵێین: "نانم خوارد".

خواردن چییە؟ کردارێکی زۆر ناوازەی لەشی مرۆڤە. جەستەی مرۆڤ کە وەکو کارگەیەکی سەرسوڕهێنەر و بێ کەموکوڕی لەلایەن یەزدانەوە بەدیهێنراوە، ئەو ماددانەی لە ڕێی خواردن و خواردنەوەوە پێی دەگات دەیگۆڕێت بۆ وزە. وزەش پێویستییەکی ئەو کردارانەیە کە جەستە پێویستی پێیانە وەکو گەرمی و جووڵە و دروست بوونی خانەی نوێ بۆ جێگرتنەوەی کۆنەکان.

هەر کە دەکەوینە جوینی ئەو پاروەی دەیخەینە دەممانەوە، هۆرمۆنەکانی هەرس کردن بەئاگا دێن، بە بەشداریی ناوەندە کۆئەندامی دەمار هەموو هەست و ماسولکە و لیکە ڕژێنەکانی ناودەم –کە پەیوەستن بە هەرسەوە– دەکەونە چالاکیی.

دوای ئەوەی کرداری جوین کۆتایی پێدێت، بەهۆی پەرچە کـرداری هەندێ دەمارەوە پارووەکە بۆ گەدە شۆڕ دەکرێتەوە. دووەم قۆناغی هەرسیش لە ڕێی ڕژێنەکانی گەدە و هەندێ جووڵەی خۆنەویستانەوە دێتە کایەوە. دواتر پارووەکە بەرەو ڕیخۆڵە باریکە ئاڕاستە دەکرێت و لەوێ خۆراکە بەسوودەکان لە ڕێی موولوولەکانی خوێنەوە دەمـژرێن. لەم نێوەندەدا جگەریش هەندێك ڕۆڵی پێـدەبڕێت. سـەرجەم ئەندامـە بچـووك و گـەورەکان و خانـەکانی لـەش، لـەم فەرمانـە گـران و شەکەتکەرەدا بەشدارن. لە هەمووشیان زیاتر دڵ ماندوو دەبێت.

لە کـاتی هەرسـدا بەشـێکی زۆری خـوێنی نێـو دەمارەکـان ڕوو لـە گەدە دەکـات، لەبـەر ئـەم هۆیـەش ناوەنـدە کۆئەنـدامی دەمـار کـەم خوێنی بۆ دەچێت.

ئێستا تێدەگـەین ئـەوەی زۆرخـۆرە و بـەزۆر خـواردن دەپەسـتێتە گەدەیەوە، چەندە جەستەی خۆی لە هیچ و خۆڕایی مانـدوو دەکـات. خواردنی زیاد لە پێویست، واتە بارکردنی بارێك لـە جەسـتە کـە پێـی بار ناکرێت. لەبەر ئەمەیە کە ئەوانەی زۆر شەیدای خواردنن زوو پیری ڕوویان تێدەکات و جوانەمەرگ دەبن.

هەر ئەندامێك تا ڕاددەیەك دەتوانێـت بەرگـەی کـار کـردن بگرێـت، ئەگـەر زیـاد کاریـان پێبکرێـت و مانـدوو بکـرێن، لـە تەمـەنێکی بچووکترەوە گەنجێتی و ساخڵەمییان لە دەست دەدەن.



(گانـدی)ی ڕابـەری بـەناوبانگی هیندی، زۆر کـەم نـانی دەخـوارد و چـەند ڕۆژ خـۆی بـە برسـێتی دەهێشتەوە، هـەر بۆیـە بەدرێـژایی تەمەنی لـە تەندروستییەکی باشـدا بـوو، قـەت نـەخۆش نەدەکـەوت... هـەرگیز ئامـادە نـەدەبوو گـوێ لـە گلەیی ئـەو نەخۆشـانە بگرێـت کـە زۆرخۆربوون و نەیاندەتوانی دەستبەرداری ئەو خووەیان بن.

## زۆرخۆری

## خۆراك وەرگرتنی باش ناگەیەنێت

ئـەوەی لـەو لێکۆڵینەوانـەی لەسـەر خـەڵکی قـەوقاز -کـە تەمەندارترین خەڵکانی جیهانن- ئـەنجام دراون، زۆر سەرنجڕاکێشـن. لـە سـەدا دووی قەوقازییـەکان تەمـەنیان سـەد سـاڵ تێپـەڕ دەکـات. دەرکەوتووە کە گرنگترین هۆکارەکانی ئـەم تەمـەن درێژییـەیان، کـار کردنی بەردەوام و زوو نوستن و زوو هەڵسان و کەمخۆرییانە.

قەوقازییـەك بـەم جـۆرە گوزارشـت لـە ڕەچـەتەی سـەد سـاڵەی دەکات:

"هەر وەکو لە بابوباپیرانمانەوە فێر بووینە: تا برسی نەبین ناچینە سەرخوان و بەر لەوەی تێریش ببین دەست هەڵدەگرین. هەر لەبەرئەمەیە وشەی خەپە لە فەرهەنگی ئێمەدا نییە".

***



یەشار کە قەڵەوترین قوتابیی پۆلەکە بوو، بە ڕوانینەکانی هاوڕێکانی تەواو ناڕەحەت بووبوو، دەیویست قسە بکات. وتم:

– یەشار! هەندێك قسەم ماوە، ئەگەر کەمێك دان بەخۆدا بگریت، ڕێت دەدەم قسە بکەیت.

محەمەدی فەیلەسوف خۆی تێهەڵقورتاند:

– مامۆستا! ڕەنگە یەشار بیەوێت دژایەتیی پارێز بکات. ڕێگەی بدەن با قسە بکات بەشکوم باسی سوودەکانی زۆرخۆریمان بۆ بکات.

– دە بزانم، یەشار قسە بکە...

یەشار بەتووڕەییەکەوە سەیری تەواوی قوتابییەکان و بەتایبەتیش محەمەدی فەیلەسوفی کرد و وتی:

– باشە، مامۆستا! با بڵێین کەممان خوارد و پارێزمان کرد و بەرۆژوو بووین، باشە ئەو خۆراکەی لەشمان وەری دەگرێت کەم ناکات؟ باش خۆراک وەرنەگرتن و لاوازی خراپ نین؟

– یەشار! ڕاست دەکەیت، کەم خۆراک وەرگرتنیش زیانی هەس.

**وەلێ با کەمخۆری و خۆراک کەم وەرگرتن لە یەک جیا بکەینەوە. چونکە دەگونجێ بە خواردنێکی کەمیش لەشمان خۆراکێکی باش وەربگرێت.** بە مانایەکی تر: دەگونجێت زۆر پەستان خستنە سەر گەدەش ببێتە هۆی بەدخۆراکی. لەوەش دڵنیاین کە خۆراک وەرگرتنی زۆر، جا ببێتە هۆی قەڵەوی یان نا، زیان بەخشە. پسپۆڕان لەمەیان کۆڵیوەتەوە. با چاوێك بگێڕین بە ڕاڤەیەکی زانستیی کۆمەڵە پزیشکێك بە سەرۆکایەتیی دکتۆر (مونیب یەغین)، ئەوان دەڵێن:

**"خۆراك وەرگرتنی زۆر نەك هەر نابێتە هۆی زیادکردنی هێزمان، بەڵکو کەمیشی دەکاتەوە. ئەمە جگە لەوەی کار لە لایەنی ئابووریشمان دەکات. دەتوانین هۆیەکانی ئەمە لە سێ خاڵدا کۆ بکەینەوە:**

**١– هەموو خۆراکێکی زیادە، لە کەناڵی هەرس و ئەندامەکانی ناوەوەی لەش کەڵەکە دەبێت، جێ دەگرێت و دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو ئەندامانە نەتوانن وەك پێویست ئەرکەکانیان بەجێ بگەیەنن. بەم جۆرە خۆراکی زیاد دەبێتە هۆی گرفتداری (قەبزی) و قەڵەوی و فەلەجی و باداری (ڕۆماتیزم) و تەنانەت شێرپەنجەش.**

٢- لەشی مرۆڤ بۆ خۆبەدوورگرتن لە زیانەکانی خۆراکی زیاد و ناپێویست فەرمانی ئەندامەکانی کۆئەندامی هەرس کەم دەکاتەوە. ئەمەش دەبێتە هۆی نەخۆشییەکانی گەدە و ڕیخۆڵە و جگەر و گورچیلەکان.

٣- ئەندامگەلی هەرسکردن دەکەونە دەردانی ئاو بە لیتر و ئەنزیمی زۆر گرنگ و پێویست، تەنها بۆ ئەوەی ئەو خۆراکە زیادەیە دەربکرێتە دەرەوە. بەم جۆرە هەوڵێکی بێئامان دەدرێت تەنها بۆ ئەوەی ئەو ماددانە بێ کاریگەر بکرێن و بە کەمترین زیان فڕێ بدرێنە دەرەوە. بێگومان لەم پرۆسەیەدا وزەیەکی زۆر بەفیڕۆ دەچێت.

یەکێك لەو نەهامەتییانەی تووشی ئەوانە دێت کە بە دەوڵەمەندی دەنازن و بەدوای هەموو شتێکدا وێڵن چێژی لێوەربگرن، خواردن لەوە دەردەکرێت کە پێویستییەك بێت بۆ خۆراك وەرگرتن بۆ ژیان و دەکرێتە هەوەسبازییەکی ژیان. هەندێك کەس لەبری ئەوەی بۆ برسێتی شکاندن بخۆن، بۆ زەوق دەخۆن. بە گوزارشتێکی تر: لەبری ئەوەی بخۆن بۆ ژیان، دەژین بۆ خواردن. ئەوە حەقیقەتێکی مێژووییە کە ئەم دەردە دەبێتە هۆی لەناوچوونی دەوڵەمەندە باوەڕ لاوازەکان و تەنانەت دەوڵەتەکانیش.



بەرچاوترین نموونـە، خـەڵکی (سـەدووم) و (گۆمـۆرە)ی نەتـەوەی پێغەمبـەر (لـوط)ن. ئـەو خەڵکانـە شـەو و ڕۆژ لـە خـەمی گەدەیانـدا بوون، بە جۆرێك لە حـەلاڵ و حـەرامیان نەدەپێچایەوە. ئەوەنـدەیان دەخوارد، خواردن دەگەیشتە قوڕگیان. لایان زەحمەت بـوو چاوەڕێ بکەن تـا گـەدەیان ئـەو خواردنـە هـەرس دەکـات، بۆیـە بەهەڵـەداوان خۆیـان دەگەیانـدە «حـەوزەکانی خـۆ ڕشـاندنەوە». ئـامرازێکی تایبەتیان دەکردە قوڕگیانەوە و خۆیان دەڕشاندەوە نـاو حەوزەکـە. ئینجا بەپەلە خۆیـان دەگەیانـدەوە سـەر سـفرە خوانـەکان و دیسـان تێیاندەپەستییەوە.

لەم بارەدا مرۆڤ خۆی دەکاتە دیلی گەدەی، دەکەوێتە ژیان تەنها لە پێناوی گەدەی. بێگومـان ئەمـەش وای لێـدەکات دابـەزێتـە ڕیـزی ئاژەڵان. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو لەگەڵ ئـەوەدا کـە خـودای گـەورە گەورەترین بەخششی – کە ئەقڵە پـێ بەخشـیوە، وەك ئـاژەڵ دەژی و، دادەبەزێتە ئاستی لە ئاژەڵ خوارتر.

مەسەلەی ئەوەی کـە ڕۆژوو چـۆن چـۆنی مـرۆڤ بـەرز دەکاتـەوە و دەیگەیەنێتە ئاسـتی فریشـتە بـۆ دوایـی دەیهێڵینـەوە، ئێسـتا باسـی سوودەکانی ڕۆژوو بۆ جەستەی مرۆڤ دەکەین.

# موسوڵمانێتی و پەیوەندیی نێوان نەخۆشی و خۆراك

بابوباپیرانمان فەرموویانە: "زۆری و بۆری". خواردنیش هەر وایە، کەم بخۆیت باشە و زۆریش بخۆیت خراپ. کاتێك زۆرخۆری زیان بەخشە، کەمی بکەیتەوە دەبێت بە سوود بەخش. بەتایبەتی ئەگەر ئەو کەم کردنەوەیە لە ڕێی ڕۆژووەوە بێت سوودەکانی هەر لە ژمارە نایەن. پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) دەفەرمووێت: **"بەڕۆژوو بن، لەشساغ دەبن"**. لە فەرموودەیەکی تریشدا دەفەرمووێت: **"هەموو شتێك زەکاتی هەیە، زەکاتی جەستەیش ڕۆژووە"**. هەر وەك لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێت، وەك چۆن زەکات پارە و سامان پاك دەکاتەوە و بەرەکەتداری دەکات، ئاواش ڕۆژوو جەستە پاکژ دەکاتەوە و کەسەکە بە شەوق و زەوقی گەنجی دەهێڵێتەوە و تەمەن درێژی دەکات.

(بەرسۆلێت) کە خاوەنی چەند لێکۆڵینەوەیەکی گرنگە لەسەر ڕۆژوو، بەوەی کە دەڵێت: **"ڕۆژوو نەشتەرگەرییەکی بێچەقۆیە"**، گەرەکیەتی گوزارشت لە سوودە زۆر و زەبەندەکانی ڕۆژوو بکات.

دکتۆر (ئەلراوی) کە توێژەرێکی ترە، دەڵێت: **"ڕۆژوو بەرگری لەش زیاد دەکات"**. زیاتریش دەڵێت: **"ئەم ڕاستییە پزیشکییە گرنگە ئیسلام پەی پێبردووە و کردوویەتییە یەکێك لە پێنج پایەکەی.**

پزیشکیی سەردەم پلۆوو وەك ڕێوشوێنێکی خۆپارێزی لە نەخۆشی و چارەسەری بەکاردەهێنێت. لەم ساڵانەی دواییدا، لە ئەمەریکا دەزگای پلۆووگرتن هاتووەتە دامەزراندن. ئەم دەزگایانە پلۆوو وەك چارەسەرییەکی نەخۆشییە درێژ خایەنەکان و زیادکردنی بەرگریی لەش بەکاردەهێنن".

لەم دەورو زەمانە، ئیدی باوی ئەوە نەماوە هەر داو و دەرمان بۆ نەخۆشی بەکاربهێنرێت، بەڵکو خواردن و خواردنەوەش بەپێی نەخۆشییەکە دیار دەکرێت. وا دیارە ئێستا بەتەواوی پەیوەندیی نەخۆشی بە خۆراکەوە بۆ هەموو لایەك دەرکەوتووە. بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە ئەوە ئیسلامە یەکەمجار پەی بەو پەیوەندییە بردووە و ڕوونی کردووەتەوە. بۆ نموونە پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) دەفەرموێت: "خانەی نەخۆشی گەدەیە، سەری چارەسەرییەکانیش پارێز کردنە".

پسپۆران هۆشیاری دەدەن

کێشی زیادە داوەتنامەی مەرگ دەبەخشێتەوە



Uzmanlar ikaz ediyor

**Aşırı kilo ölüme davetiye çıkarıyor**

ANKARA (UBA) — Hacettepe Üniversitesi Beslenme Bölüm Başkanı Prof. Dr. Ayşe Baysal şişmanlığın ölüm nisbetini arttırdığını belirtti.

پارێزیش واتە خۆراك وەرگرتن بەقەد ئەوەی لەگەڵ تەندروستیدا دێتەوە.

لــه ڕۆژگــاری ئەمڕۆمانــدا پزیشــکە ئەورووپاییــەکان ئامۆژگــاریی نەخۆشەکانیان دەکەن بەڕۆژوو بن، خۆشیان هــەمان شـت جێبــەجێ دەکــەن. بــۆ نموونــە دکتــۆر (ڤیکتــۆر پۆچــێت) کــە پزیشــکێکی فەرەنساییە و بەرهەمــەکانی بـۆ زۆربــەی زمانــە زینــدووەکانی جیهـان وەرگێــڕدراون، ئەمــە یــەك لــە ئامۆژگارییەکانییــەتی: "وەکــو موســوڵمانەکان ســاڵانە لــە کــاتێکی دیــارکراودا ڕۆژوو بگــرن، بــۆ ماوەیەکی زۆر خۆتان برسی بکەن و ئـاوی هــەڵووژە بخۆنــەوە. بــەو شێوەیە گەدەتان دەحەسێتەوە".






## ڕۆژوو...

## چاودێرییەکی ساڵانەی جەستە

ئەوانەی بەڕۆژوو دەبن نەك هەرگەدەیان بە تەنها، بەڵکو سەرتاپای جەستەیان دەحەسێتەوە. چونکە ڕۆژوو ماوەی ئەندامەکانی کۆئەندامی هەرس دەدات کە دوای ساڵێك ماندوو بوون بە هەرسی خواردن و خواردنەوەی جۆراوجۆرەوە پشوویەك بدەن و بێنەوە سەر خۆ و بەهێز ببنەوە. وەك چۆن ئەو مەکینانەی بەردەوام لە کاردان پێویستیان بە چاودێری هەیە، ئاواش ئەندامگەلی هەرس بە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان چەور دەبن و پاك دەبنەوە و پشوو دەدەن.

به بەتاڵیی گەدە باری جەستە سووك دەبێت و بەئاسانی ئەركەكانی بەجێ دەگەیەنێت.

دكتۆر (كامەران شەنەل) بەم جۆرە باسی گرنگیی پشوودانی كۆئەندامی هەرس دەكات:



"ئەوەی ڕاستی بێت لە سەدا پەنجای نەخۆشییەكان لە ئەنجامی تێكچوونی كەناڵی هەرسەوە پەیدا دەبن. هاوسەنگی ڕاگرتن لەنێوان ترش و تفت و خوێ زۆر پێویستە بۆ تەندروستییەكی تەواو، بەڵام ئێمە بە گوێرەی زەوق و ئیمكانییەتمان دەخۆین نەك بە گوێرەی پێویستی و هاوسەنگی ڕاگرتن لەنێوان ئەو ماددانە".

لەشمان كە بە شێوەیەكی ناڕێك خۆراكی پێدەدەین، ئەگەر بۆ ماوەی مانگێك بە ڕۆژ هیچ نەخۆین سوودێكی زۆری پێدەگات. بەم شێوەیە بەڕۆژوو بوون دەبێتە هۆی توانەوەی ڕۆنە نیشتووەكانی سەر ناوپۆشی ئەندامەكانی ناوەوە. وەك چۆن دار و درەخت و باخەكان ساڵانە هەندێ لق و پۆپیان لێدەكرێتەوە، جەستەش بە هەمان شێوەی لێدێت و دەبووژێتەوە.

(پیری مۆولین) كە پرۆفیسۆرێكی فەرەنسایيە و لە ڕۆژنامەی «Günaydın – ڕۆژباش» دا ڕێنمایی تەندروستی بلاودەكاتەوە،

لەژێر سەردێڕی: "**هەفتەی ڕۆژێك بەڕۆژوو ببن**"دا نووسیویەتی: "یەكێك لە بەكەڵكترین دیاردەكانی جیهانی ئیسلامی ڕۆژووگرتنە. ڕۆژوو هەم لە ڕووی فیزیكییەوە و هەمیش لە ڕووی ڕۆحییەوە وچان بە لەش دەدات. شانەكانی لەش پاك دەكاتەوە و ژارە كەڵەكە بووەكان فڕێ دەداتە دەرەوە. ئا بەم جۆرە موسوڵمانان ساڵی مانگێك پشوو بە لەشیان دەدەن. نەبوونی ڕۆژوو لە ئاینی مەسیحییەتدا خەسارەتێكی گەورەیە".

بەڕۆژوو بوونی ڕۆژێك لە هەفتەیەكدا بە دەستەواژەیەكی تر پارێز كردن لە خواردن و، خواردنەوەی ئاوی میوە بەتەنها، زۆر بەكەڵكە. بەمە لەش بەهۆی ئەوەی شانەكانی پاك دەبێتەوە و ژارەكان لەناودەچن تواناى بە بەردا دێتەوە".

***

هەواڵێكی دیكە لەبارەی ڕۆژووەوە، لە ڕۆژنامەی (*Kelebek* – پەپوولە)وە وەردەگرین... لەژێر سەردێڕی: "**بەڕۆژوو بوونی ڕۆژانە لەپێناوی لەشساغیدا**" باسی ئەوە دەكات كە ئەوانەی دەیانەوێت كۆئەندامی هەرس و تەواوی لەشیان لە ژار و چەوری ڕزگار بكەن، بێهیچ دوودڵییەك دەبێت بەڕۆژوو بن. لە هەمان نووسیندا هاتووە: بۆ ئەو ڕیخۆڵانەی كێشەیان هەیە و باش ئیش ناكەن، لەبری وەرگرتنی داو و دەرمانی ڕەوانكەر (مُسَهِّل)، چاكتر وایە ڕۆژووگرتن تاقیبكەنەوە. ئینجا دەڵێت: "ئەو ڕۆژووەی لەسەر ئێمەی موسوڵمان

فەرزە وا ئێستا لەنێو هەموو نەتەوەکانی جیهان ڕەغبەتی لەسەرە، چونکە هەنووکە وڵاتە ئەوروپاییەکانیش دان بەوەدا دەنێن کە ڕۆژووگرتن هۆکارێکی فرە باشە بۆ پاك کردنەوەی لەش.

ئەگەر چی تا ئێستا وەکو ئێمە بۆ ماوەی مانگێك بەڕۆژوو نابن، بەڵام گەیشتوونەتە ئەو قەناعەتەی بەڕۆژوو بوونی ناوبەناو کاریگەریی زۆر ئەرێنیی لەسەر جەستە هەیە".

***



گومانی تێدا نییە کە لەگەڵ زیاتر بەرەو پێشچوونی لێکۆڵینەوە زانستییەکاندا، ڕۆژووی ئیسلام پشت ڕاست دەکرێتەوە. وا لە ئێستاوە هەندێك لە زانا ناودارەکان ئامۆژگاریی خەڵکی دەکەن بەڕۆژوو بن. ئەگەر ئەوە لەبەرچاو بگرین کە تا ئەم دواییانەش بەڕۆژوو بوون بە دواکەوتوویی دادەنرا، ئەم پێشڤەچوونە سەرکەوتنێکی مەزنە بۆ موسوڵمانان.

موسوڵمانێتیی بەهۆی ئەوەی توانیویەتی وا لە ئەقڵ و مەنتق و زانست بکات دانی پێدا بنێت، کەوتووەتە ڕەگ داکوتان لە ناخی گشت مرۆڤایەتیدا.

قوتابییەکانم ڕاسپارد بۆ وانەی دواتر لەو نەخۆشییە ماددی و مەعنەوییانە بکۆڵنەوە کە ڕۆژوو بۆیان باشە. لە کۆتایی وانەکەدا زۆرێک لە قوتابییەکان بڕیاریان دا وەکو پێغەمبەرمان (درووودی خودای لێبێت) ڕۆژانی دووشەم و پێنج شەممان بەڕۆژوو بن. نزیکەی هەموویان بڕیاریان دا ڕۆژ بە ڕۆژ بژمێرن تا ڕەمەزان دێت و نەشهێڵن ڕۆژێکیان لە دەست بچێت...

## ئەو نەخۆشییانەی ڕۆژوو چارەیان دەکات

چەند قوتابییەك لە سەرچاوەی جۆراوجۆر بە شوێن ئەو نەخۆشییانەدا گەڕابوون کە ڕۆژوو بۆیان باشە. منیش هەندێك لەوانەی لە سەرچاوەی گرنگەوە دەریان هێنابوو، لە دەفتەرەکەی خۆمدا نووسیمنەوە. با چاوێك بە هەندێکیاندا بخشێنین:

یەکێك لەو لێکۆڵینەوانەی پێشکەش بە کۆنگرەی نێودەوڵەتیی زانستە فسیۆلۆژییەکان کراوە کە کۆلێژی پزیشکیی زانکۆی ئەستەنبووڵ لە ٢٠- ٢٥ی ئەیلوولی (١٩٨١)دا ڕێکی خستووە دەربارەی ڕۆژووە. ئەم لێکۆڵینەوەیە لە ڕێی ڕۆژووی ئیسلامەوە تاوتوێی زۆر بابەتی گرنگی کردووە، دووپاتی ئەوەی کردووەتەوە کە لە ڕۆژووگرتندا برسێتیی تەواو بوونی نییە. بەم جۆرە هیچ

پەرستشێك نییە جەستە بەرگەی نەگرێت و هەڕەشە بێت بۆ سەر ساغڵەمیی.

نووسەری بەناوبانگمان (پەیامی سەفا) کە لە بەرهەمەکانیدا پانتاییەکی فراوانی بۆ بابەتە پزیشکییەکان داناوە، باس لەوە دەکات کە ڕۆژوو پارێزێکی بەکارە بۆ بەرگرتن لە هەریەك لە:

- ڕەق بوونی بۆرییەکانی خوێن
- بەرز بوونی ڕێژەی کۆلیسترۆڵ
- بەرزە پەستانی خوێن
- قەڵەوی
- جەڵتە
- سینگە دڕێ
- برینی گەدە
- نەخۆشییە جۆراوجۆرەکانی گەدە و ڕیخۆڵە
- شەکرە
- میزاو بوونی خوێن (یووریمیا)
- نەخۆشییەکانی جگەر و زراو و گورچیلە

ئەمە بە مەرجێك کە لە کاتی بەربانگدا تۆڵەی برسێتییەکە نەکرێتەوە.

***

سەرچاوەیەکی تر کە یەکێك لە قوتابییەکان هێنابووی، باسی لەوە دەکرد کە چۆن کۆئەندامی هەرس بە ڕۆژووگرتن پاك دەبێتەوە:

ئەو ماددانەی بەتەواوی هەرس نابن لە پێچ و پەناکانی ئەندامەکانی ناوەوەی لەش کەڵەکە دەبن و دەمێننەوە، لەگەڵ کاتدا دەبنە هۆی ژەهراوی بوونی لەش. گەدەی بەڕۆژوو دەکەوێتە تواندنەوەی ئەو ژەهرانە. کاتێك گەدە و ڕیخۆڵە هیچیان دەست ناکەوێت تا هەرسی بکەن، دەکەونە هاڕینی ئەو ماددە زیادانە. ماددەی کۆلیسترۆڵ کە دەبێتە هۆی ڕەق بوونی بۆرییەکانی خوێن، لە سایەی ڕۆژوو ڕێژەکەی کەم دەبێتەوە و دێتەوە ئاستی ئاسایی خۆی.

دکتۆر (خالووق نووریاقی) کە خاوەنی چەندین توێژینەوەیە لەسەر ئەم بابەتە دەڵێت:

"لە کاتی بەڕۆژوو بووندا ئاستی کۆلیسترۆڵ لە خوێندا دادەبەزێت. بەو هۆیەوە دیواری بۆرییەکانی خوێن، ئەو کۆلیسترۆڵانەی لەپاڵیاندا خۆیان مەڵاس داوە، هێدی هێدی دەیانخەنە بەر تەوژمی خوێن. بەم جۆرە ڕەقییەکەیان نامێنێت. بەتایبەتی دوای نیوەڕوان، کە پەستانی خوێن دێتە خوارێ، پشوویەکی تەواو فەراهەم دێت. بەم شێوەیە ڕەق بوونی خوێنبەران (*Arteriosclerosis*) کە هۆکاری گیرانی خوێنبەرەکانی دڵ و جەڵتەیە و بە مەترسیدارترین نەخۆشیی

سەردەم دادەنرێت، بەهۆی ڕۆژوو و دەستنوێژەوە تا ڕادەیەکی زۆر کەم دەبێتەوە.

بەندە توێژینەوەیەکم لەسەر پەستانی خوێنی ٣٠٠ کەسی



د. خالووق نووورباقی

بەسالاچوو - کە ڕۆژوویان دەگرت و بەردەوام دەستنوێژیان هەبوو - کرد، بۆم دەرکەوت کە بچووکترین نیشانەی ڕەق بوونی خوێنبەریان نییە. ئەگەر چی تەمەنیان ٦٥ ساڵ بە بانەوە بوو، کەچی پەستانی خوێنیان ١٢ی تێپەڕ نەدەکرد.

ئینجا ئەگەر بێینە سەر دڵ، سێ شت هەیە کاریگەریی خراپیان لەسەر دڵ هەیە:

١- ڕەق بوونی بۆرییەکانی خوێن

٢- سست بوونی دەمارەکان

٣- پڕیی بەردەوامی گەدە

ئەم سیانە هەرسێکیان لە دەمی بەڕۆژوو بووندا ئۆتۆماتیکییانە نامێنن. بۆیە دڵ هەم لە ڕووی ماددی و هەمیش لە ڕووی مەعنەوییەوە ساغ و سەلامەت دەبێت".

***

لەنێو چەندین زانیاری کە دەربارەی ئەوەی ڕۆژوو کۆئەندامی دەمار ڕێکدەخات، با ئەم هەواڵە بخوێنینەوە کە لە حوزەیرانی ١٩٨٤

لە ڕۆژنامەی (*Posta* – پۆستە)دا بڵاوکراوەتەوە. کورتەی هەواڵەکە کە: "ڕۆژوو مرۆڤە دەمار گرژەکان هێمن دەکاتەوە" سەردێڕەکەیەتی، ئەمەیە:

"هێڵکارییەکانی مێشك ئەوەیان دەرخستووە کە ئەگەر کەسە پەلەماردەر و ئازاردەرەکان مانگێك ڕۆژوو بگرن، نەخۆشییە دەروونییەکانیان چاك دەبێتەوە. بەمە سوودێکی دیکەی ڕۆژوو جگە لە سوودەکانی بۆ گەدە دۆزرایەوە".

بەم شێوەیەی باس کرا لەش دوای ئەوەی ماددە کەڵەکە بووە زیانبەخشەکان فڕێ دەداتە دەرەوە ساغی و سەلامەتی بەدەست دەهێنێت.

***



ڕۆژوو کە هێزی ڕووبەڕووبوونەوەی برسێتیی و تینوێتیی زیاد دەکات، لە هەمان کاتدا کاریگەریی هەیە لەسەر زیادکردنی هێزی خۆڕاگری و ڕووبەڕوو بوونەوەی نەخۆشییەکان.

ئەوەش سەلمێنراوە کە ڕۆژوو کاریگەرییەکی بەرچاوی هەیە لە زیادکردنی هێزی بیرکردنەوە و ژیری. لەبەرئەوەی خانەکانی مێشك چەند قاتی خانەکانی دیکەی لەش کار دەکەن، چەند قاتی ئەوانیش

پێویستیان بە خوێن هەیە. بۆیە بە مێشك دەڵێن: "ئەندامی لە خوێن تێر نەبوو". بۆ ئەوەی ژیری و بیرکردنەوە بەهێز ببن دەبێت بڕێکی زۆری خوێن ڕوو لە مێشك بکات، هەر لەبەر ئەم پێویستییەیە کە گەورەترین و ئەستوورترینی دەمارەکان، بە مێشکەوە بەستراونەتەوە.

بەڵام کاتێك کۆئەندامی هەرس پڕە لە خواردن تەوژمی خوێن بۆ مێشك کەم دەبێتەوە. بەهۆی ئەوەی خوێن بۆ دابین کردنی پێویستییەکانی کۆئەندامی هەرس پێویستە، لە گەدە و ڕیخۆڵەکاندا چڕ دەبێتەوە، هەر بۆیە مرۆڤ دوای نان خواردن هەست بە خاوبوونەوە دەکات. لەو بارەشدا زەین بێهێز دەبێت، بیر تەڵخ دەبێت، تەوەزەلی و خەواڵوویی خۆیان دەسەپێنن. هەرچی لە کەسی ڕۆژووگرە، ئەوە بەپێچەوانەوە بیر کراوە



و درەوشاوە دەبێت. بەهۆی ئەوەی ئەندامگەلی هەرس لە بارگرانی قوتاریان دەبێت و کەمتر پێویستیان بە خوێن دەبێت، بڕی پێویست لە تەوژمی خوێن بۆ مێشك بە ئاسانی دەستەبەر دەبێت.

لەم ڕووەوە پزیشکی سەردەم ئامۆژگاریمان دەکات کاتێك کارێکمان لەبەردەمدایە -کە پێویستیی بە زەین ڕۆشنی هەیە- بەڕۆژوو ببین. ئێوەش دەتوانن لە تاقیکردنەوە نووسراو و

زارەکییەکانتاندا تاقیی بکەنەوە. ئەوسا بۆتان دەردەکەوێت کە لەو تاقیکردنەوانەی بەڕۆژوو دەبن، چەند سەرکەوتوو دەبن و لەوانەش کە بە گەدەی پڕەوە بەشداریی تێدا دەکەن چەند سەرنەکەوتوو دەبن.

کەم خواردن و بەڕۆژوو بوون پەرستشێك نییە هەر پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) پێشنیازی کردبێت، بەڵکو پێغەمبەرانی پێش ئەویش (سەلامی خوایان لەسەر بێ) بۆ خەڵکی پێشنیازیان کردووە و خۆیشیان ئەنجامیان داوە.

وەك لەمەوبەریش ئاماژەمان پێدا تا ئێستا کەسێك نەبووە تێرخۆر بووبێت و دۆزینەوەیەکی هەبێت و داهێنانێکی کردبێت و پایەدار بووبێت.

کەمال دەستی هەڵبڕی:

– فەرموو، کەمال! بزانم چی دەڵێیت؟

– مامۆستا! ئایا قوتابییەك ڕۆژوو بگرێت بەڵام وانەکانی باش نەخوێنێت، لە یەکێکی تر کە زۆر بخوات و بخواتەوە بەڵام باش کۆشش بکات، زیاتر سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت؟



– نەخێر! بۆ سەرکەوتن بەر لە هەر شتێك، کۆشش کردن گەرەکە.

– بەلام تۆ کەمێك پێشتر وتت کە بەڕۆژوو بیت زیاتر سەرکەوتن بەدەست دەهێنیت.

– بەڵێ، بەلام ئەم دووانە دوو شتی تەواو لێك جیان. من وتوومە دوو قوتابی کە وەکو یەك کۆششیان کردووە ئەوەیان کە بەڕۆژووە یان هەر هیچ نەبێت زۆری لە گەدەی نەپەستووە پتر سەرکەوتوو دەبێت. ئایا ئەگەر بڵێین بەڕۆژوو بوون هۆکارێکی گرنگە بۆ سەرکەوتن، مانای وایە ئەگەر بەڕۆژوو بیت ئیدی پێویستت بە کۆشش کردن نامێنێت؟!

لێرەدا فەیلەسووف هەڵچوو:

– محەمەد! قسە بکە.

– مامۆستا! دیارە کەمال ئەم بەیانییە زۆری خواردووە.

– بە چیدا دەزانیت؟

– ئەوە نییە لە قسەکانت ناگات...

– بەڵێ! با بەم گاڵتەیەی محەمەد، ئەم بابەتە دابخەین. لە وانەی داهاتوو، سوودە مەعنەوییەکانی ڕۆژوو دەخەینە بەر باس، سوودە مەعنەویی و ئەخلاقیی و کۆمەلایەتییەکانی...

مرۆڤ ئەو ئافەریدەیەیە کە لە باریدایە هەم خۆی بکاتە فریشتە و هەمیش ئاژەڵ. تاقیکردنەوەی دونیا بۆ ئەوەیە دەربکەوێت بوون بە فریشتە هەڵدەبژێرێت یان بوون بە ئاژەڵ. ڕۆژووش پەرستشێکی گرنگە کە دەستی مرۆڤ دەگرێت تا ببێتە فریشتە، ڕۆحی بەرز

دەکاتەوە و پایەبەرزی دەکات. چونکە لە کاتی بەڕێژوو بووندا مرۆڤ هەر وەك فریشتە نە دەخوات و نە دەخواتەوە، هەروەها لە ئارەزووە زایەندییەکانی خۆی دوور دەخاتەوە. بە گوزارشتێکی دی بە ویستی خۆی، خۆی بە فریشتە دەچوێنێت.



ئەمە لە هەمان کاتدا ئەوە دەگەیەنێت کە ئێمە لە بەرەی جەستەی فانی و کاتیدا نین، بەڵکو لە بەرەی بونیادە ئەسڵەکەمانداین کە ڕۆحمانە و بە نەمری بەدیهێنراوە. ڕۆژوو مرۆڤ لە نەفس و ئارەزووەکانی دوور دەخاتەوە و لە خودای نزیك دەخاتەوە، چونکە تا ئەو کاتەی بەسەر ئەو دوژمنە ناوخۆییەماندا –کە (نەفس)ی پێدەوترێت و تۆوی خراپە لە ناخماندا دەچێنێت– زاڵ نەبین، ڕزگار بوون لە دەست شەیتان زۆر دژوارە، چونکە شەیتان توانیویەتی نەفس وەك هەماهەنگکارێك بۆ خۆی لە ناخماندا بدۆزێتەوە. ئایا پێویست ناکات پەندێکی باش بەو نەفسە بدەین کە مرۆڤ لە مرۆڤایەتی دەخات و لە خودا و فەرمانەکانی دەکات؟

ئەو پەندەی نەفس هەرگیز لە بیری ناکات، ڕۆژووە. واتە ڕووبەڕوو بوونەوە و پەکخستنی سەرەکیترین و بەردەوامترین داواکاریی و برسی کردنییەتی.

بەم شێوەیە مرۆڤ لە دەستەوسانی و بێتوانایی خۆی دەگات، خۆی تەسلیمی ئەو خودایە دەکات کە خاوەنی هێز و دەسەڵاتی هەقیقییە و، مل بۆ فەرمانەکانی کەچ دەکات، لە دەست خۆبەگەورەزانین و بەخۆنازین و یاخیبوون ڕزگاری دەبێت، لەوە دەگات کە خۆی ئافەریدەیەکی سادەیە و خوداش تاکە پەروەردگارێکە کە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت.

لە ئەنجامی ئەمەشدا مرۆڤ باشتر لە دەست ئەو گوناه و خراپەکارییانەی خودا قەدەغەی کردوون، هەڵدێت. خۆ لە قورئانی پیرۆزیشدا ئاماژە بەوە دراوە کە: "پەرستشی ڕەمەزان بۆ خۆ بەدوور گرتنتان لە خراپەکارییەکان، لەسەرتان فەرز کراوە". پێغەمبەریشمان (درودی خودای لێبێت) ڕۆژووی بە قەڵغان چوواندووە. گومانی تێدا نییە ئەم قەڵغانە، قەڵغانێکی مەعنەوییە و مرۆڤ لە گوناهەکان دەپارێزێت.

ڕەمەزان کە مانگی ڕۆژووە، مرۆڤ لەسەر بەرەنگاربوونەوەی گشت ئارەزووە ماددی و مەعنەوی و داوا لە ڕاددە بەدەرەکانی ڕادەهێنێت. هەر لەم ڕووەوەیە کە لە وڵاتی خۆمان و گشت وڵاتە ئیسلامییەکاندا، ئەو مانگەی کە کەمترین ڕێژەی تاوانی تێدا دەکرێت، ڕەمەزانە.

# ڕۆژوو... قوتابخانەی ڕەوشتە

کەواتە لەم مانگەدا نەك هەر گەدە بەتەنێ، بەڵکو ڕۆحیش پارێز دەکات و لە تێر نەبوویی ڕزگاری دەبێت. کاتێك ڕۆح بۆ ماوەی سی ڕۆژ پەنا دەباتە بەر قەڵای قایمی ڕەمەزان و خۆی لە هەموو خراپەیەك بەدوور دەگرێت، لەسەر چاکەکاری ڕادێت. ئەگەری بەردەوام بوونی لەسەر ئەو کارە چاکانەی لە ماوەی مانگی ڕەمەزاندا لێیان ڕاهاتووە، لەدوای ڕەمەزانیش زۆر بەهێزە. ئەگەر بەڕۆژوو بوونی ڕەمەزان بەو جۆرە بوو مانای وایە بەهای خۆی پێدراوە. دوای ڕەمەزان ئەگەر پارێزی گەدەش کۆتایی پێهات، دەبێت پارێزی ڕۆح بەردەوامیی هەبێت. ئەگەر ئەم ئامانجە پێکرا ئەو کاتە مانگی ڕەمەزان دەبێتە فێرگەیەکی ئەخلاقی. موسوڵمانان کە لەم قوتابخانەیە دەردەچن فێری ئەوە دەبن کە چۆن خۆیان لە خراپەکاریی بەدوور بگرن و چاکەکاریی بکەنە پیشەیان.



بەڵام جیاوازیی ئەم قوتابخانەیە لەگەڵ قوتابخانەی تر ئەوەیە کە بەدرێژایی تەمەن ساڵی تەنها مانگێك دەوام هەیە. خۆ ئەگەر بشتەوێ دەتوانی ساڵی چەند دەرسێکی زیادیش لەو قوتابخانەیە وەربگریت...

* * *

پێغەمبەرمان (درودی خودای لێبێت) ئامۆژگارییەکی بۆ قوتابییانی قوتابخانەی ڕەمەزان هەیە:

**" ڕۆژووەوان با خۆی نەفام نەکات و قسەی ناشیرین نەکات. ئەگەر کەسێك ویستی لەگەڵیدا بە شەڕ بێت و شەڕەقسەی لەگەڵدا بکات، با دوو جار پێی بڵێت: "من بەڕۆژووم"(خۆت بە منەوە خەریك مەکە)..."**

هەر وەك لەم ئامۆژگارییەوە دەردەکەوێت، پێویستە ڕۆژوو بە هەموو ئەندامەکانی لەشمانەوە بگرین، نەك هەر گەدەمان بەتەنها. ئەو کاتە ڕۆژوو تەواو و هەقیقییە کە دەست و پێ و مێشك و چاو و گوێ هەموو پێکەوە بەڕۆژوو بن.

ئێستا پێم بڵێن، چۆن دەتوانین وا لەم ئەندامانەمان بکەین بەڕۆژوو بن؟

- بەوەی بە پێیەکانمان بەدوای خراپەدا نەڕۆین، ڕوو لە شوێن و کاری گوناه نەکەین، بۆ خێر و چاکە هەنگاو هەڵبگرین. بەم جۆرە پێیەکانمان لە ڕۆژووگرتندا بەشدار دەبن.

– ئافەرین عەلی!... با خەدیجەش ڕۆژوو گرتنی دەستەکانمان بۆ باس بکات.

– ئەگەر بە دەستەکانمان کارێك نەکەین زیان بە کەسانی تر بگات، لە کاری خێر و چاکەدا بەکاریان بێنین، ئەوا ئەوکات دەستەکانیشمان بەڕۆژوون.

– با (ئۆیا)ش ڕۆژووی چاوانمان بۆ باس بکات.

– چاوەکان بەوە لە ڕۆژوودا بەشدار دەبن کە سەیری شتی نابەجێ و بێکەڵك و گوناهیان پێنەکەین، بەڵکو بیانبڕینە سەر شتی بەسوود و پەندبەخش، وەك ئەوەی قورئان و کتێب و وانەکانمانیان پێ بخوێنین.

– ئافەرین ئۆیا! ئەی کێ ڕۆژووی گوێمان پێدەڵێت؟ با (نەلان) ئەمەمان پێبڵێت.

– گوێکانمان بەوە لە ڕۆژوودا بەشدار دەبن، کە گوێ لە قسەی زیاد و بێکەڵك نەگرین، بەدووریان بگرین لە بیستنی قسەی پڕوپووچ و قسەلۆك. گوێ ڕابدێرین بۆ قسەی ڕێك و جوان، وەکو قورئان و قسەی بەسوود و مەولوود و موناجات.

– نەلانیش باشی هێنا، ئێستا سەرەی ڕۆژووی مێشکە. ئەگەرچی محەمەدی فەیلەسووف دەستی بەرز کردووەتەوە، بەڵام با کەسێکی دی کە کەم دەست بەرز بکاتەوە، قسە بکات:

ڕەجەب! بۆمان باس بکە کە ڕۆژووی مێشك چۆنە؟

- مامۆستا! دەبێ مێشکمان لە ڕێی ڕاستدا بەکاربهێنین، واتە دەبێت بە بیرکردنەوەی جوان و بەسوود نەك شتی خراپ سەرقاڵی بکەین. مێشکێك بیری جوان بەرهەم بێنێت ئەوا وەکو هەموو ئەندامانی دی بەڕۆژووە.

- باشە، با ئێستاش محەمەدی فەیلەسووف فەیلەسووفێتیی خۆی بنوێنێت. بۆ ئەوەی مێشك لە ڕۆژوو گرتن بەشدار بێت، پێویستە بیر لە چی بکاتەوە؟

- مامۆستا! هەموو بیرکردنەوەیەك کە لە ڕێی ڕاست بێت و سوودی هەبێت بە پەرستش دێتە ئەژمار. تەنانەت پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) باسی ئەوەی کردووە کە یەك کاژێر لەم جۆرە بیرکردنەوەیە لە شەست ساڵ پەرستشی سوننەت خێری زیاترە، بەڵام کە دزێك کە بەدرێژایی شەو خەریکی بیرکردنەوەیە لە دزی گوناهی زۆری دەگات. چونکە بیرکردنەوە و پلان دانان بۆ دزی کارێکی چەوتە و هەر بۆیەش گوناهە. بەڵام ئەگەر لەبری ئەوە بیر لە شتی تر بکاتەوە، وەك ئەوەی بیر لە پایەیەکی باوەڕ بکاتەوە و هەوڵی



تێگەیشتنی حیکمەتەکانی بدات، دە قات پەرستشی ئەنجام داوە. مێشك ئەمە بکات بەشدار دەبێت لە ڕۆژوو.

***



● بۆ ئەوەی خودا ڕۆژوومان گیرا بکات، پێویستە زمانمان لە غەیبەت و قسەی خراپ کردن بە خەڵك بپارێزین.

ئێستا دوو فەرموودەی پێغەمبەر (درووودی خودای لێبێت) لەم بارەیەوە لە دەفتەرەکانتاندا بنووسنەوە:

یەکەم: "هەر کەسێك واز لە درۆ و دەلەسە نەهێنێت، خودا هیچ نرخێك بە واز لە خواردن و خواردنەوە هێنانی نادات".

دووەم: "پێنج شت خێری ڕۆژوو دەبات:

١- درۆ کردن

٢- غەیبەت کردن

٣- قسە هێنان و بردن

٤- سوێند خواردن بە درۆ

٥- چاو برپینە حەرام

هـەر وەك لـەم فەرموودانــە بـەڕوونی دیـارە، ڕۆژووی تـەواو ئـەو ڕۆژووەیــە کــە بــە دوورکەوتنـــەوە لــە ســـەرجەمی گونــاه و هێڵــە سوورەکانی خوداوە دەگیرێت.

* * *

لایـــەنێکی دیکـــەی ڕۆژوو ئەوەیـــە کـــە دەرســـێکی ئـــەخلاقی و کۆمەڵایەتییە، چونکە مرۆڤ فێر دەکات برسێتی و تینوویێتی چییە، وای لێـدەکات بـیر لــە حـاڵی ڕەش و ڕووت و برسـییەکان بکاتــەوە. کەسێك بیر لـە حـاڵی ئەوانـە بکاتـەوە، ڕەنگـە بـیر لـەوەش بکاتـەوە یارمەتییان بدات. بەڵام کەسێك نـەزانێت ڕۆژوو چییە زەحمەتـە ئـەم بیرە بکاتەوە. هەر بۆیەشە بابوباپیرانمان وتوویانـە: "تێـر ئاگـای لـە برسی نییە".

ئەمــە ئــەوە دەگەیــەنێت ڕۆژوو لــە ڕێــی یادخســتنەوەی حــاڵی هەژارانــەوە پــەرە بــە هەســتی فریــاگوزاری دەدات. مـرۆڤ ئـەو کاتـە مرۆڤـێکی تەواوە کە بیر لە یارمەتیدانی کەسانی تر بکاتەوە. ئـەوەی هـەر لـە خـەمی خـۆی و بەرژەوەندییـە تایبەتییـەکانی خۆیدایـە بـە مرۆڤێکی تەواو نایاتـە ئـەژمار. لـەم ســـۆنگەیەوە ڕۆژوو پەرستشـــێکە مرۆڤ دەکات بە مرۆڤ.



نابێت ئەوەش لە بـیر بکـەین کـە هۆکاری زۆربـەی بـارگرژی و شـەڕ و

شۆڕ و یاخیبوونەکانی ئەم دونیایە برسێتییە. چاوی برسی هیچ نابینێت. ڕۆژوو حاڵی برسییەکان لە تێرەکان دەگەیەنێت و کۆمەکییان بۆ دەستەبەر دەکات، بەمەش بەر لە یاخیبوونی برسییەکان دەگرێت. دەتوانین بڵێین بەدرێژاییی مێژوو لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا یاخی بوون و ڕاپەرینێك بەهۆی برسێتییەوە ڕووی نەداوە، بەڵام لە ئەورووپا ڕووی داوە. هەر وەك نموونە، لە فەرەنسا و لە سەردەمی (لویسی چواردەهەم)دا خەڵك بەهۆی برسێتی و نەبوونییەوە ڕاپەڕیون. خەڵکی ڕاپەڕیو لە بەردەم کۆشکی فەرمانڕەوا کۆبوونەتەوە و هاواریان کردووە: "برسیمانە، نانمان دەوێت!". شاژنیش هاتووەتە بەلەکۆنەکەوە و وتوویەتی:

– چەند بێ ئەدەبن، چۆن دەبێت مرۆڤ لە بەر بێنانی وا بکات. ئەگەر نانتان نییە، شیرینەمەنی بخۆن!"

## سوپاسێکی بێپایان

ڕۆژوو جگە لە ڕۆڵە پەروەردەییەکەی کە هەستی بەدەمەوەچوونی هەژاران زیاد دەکات، لایەنێکی گرنگی دیکەی ئەوەیە مرۆڤ لەسەر شوکرانەبژێری ڕادێنێت.

– کێ پێمان دەڵێت شوکرانەبژێری چییە؟

– شوکرانە ئەوەیە لەبەرانبەر چاکەیەکدا مەمنوونی دەربڕیت.

– چاودێری پۆل جوانی باس کرد، بەڵام ئایا ناتوانین بە جۆرێکی دی پێناسەی بکەین؟

– مامۆستا ! شوکرانەبژێری ئەوپەڕی سوپاسگوزارییە، کە بەرانبەر خودا دەردەبڕدرێت.

– ئافەرین محەمەد ! پێناسەکردنێکی فەیلەسووفانە بوو. بێگومان تا بڵێی قەرزداری سوپاسگوزارییین بەرانبەر بە خودا. بەرانبەر ئەو هەموو چاکەیەی بەرانبەری کردووین شوکرانەی دەکەین – کە ئەوپەڕی سوپاسگوزارییە.



بەڵام بۆ ئەوەی مرۆڤ هەمیشە شوکرانەبژێر بێت، یان بۆ ئەوەی شوکرانەکەی لە دڵەوە بێت دەبێت زۆر هەست بە موحتاجی بکات. بۆ نموونە: کاتێك یەکێك کە زۆر برسیی نییە دەکەوێتە خواردن، لەبەرئەوەی هەستی بە برسێتی نەکردووە ڕەنگە لە بیری بچێت سوپاسی خودا بکات. خۆ ئەگەر سوپاسیشی بکات، ڕەنگە لە کانگای دڵییەوە نەبێت. بەڵام بیر لە کەسێك بکەنەوە کە زۆر برسیی بووە یاخود بەڕۆژوو بووە، دەبینیت ئەگەر نانەڕەقێکیشی دەست بکەوێت زۆر شوکرانەی خودا دەکات، ئەوەی بە بیردا دێت کە ئەوەی دەیخوات

بەخششی خودایە. کاتێك ئەو سکەی تێر دەکات کە پێشتر قوڕەی دەهات بەدڵ شوکرانەی خودا دەکات...

کەواتە ڕۆژوو ئەو خودا مەزنەمان بیر دێنێتەوە کە بە قودرەتی خۆی ئەو خواردن و خواردنەوانەی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون و پێشکەشی ئێمەی کردووە، ئەمەش وامان لێدەکات شوکرانەی بکەین.

بۆ ئەوەی بەچاکی لەم لایەنەی ڕۆژوو بگەن، بیرێك لە خوانی بەربانگ بکەنەوە. زۆر کەمی ماوە بۆ ڕۆژوو شکاندن ئێوەش لەگەڵ دایك و باوك و خوشك و براکانتان لەسەر سفرە دانیشتوون و چاوەڕێی کاتی ڕۆژوو شکاندنن. جا یان ئەوەیە تۆپ دەتەقێنرێت یان مەلا بانگ دەدات، یانیش لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکانەوە کاتی بانگ دەزانن. ئەو زەوق و خۆشییەی ئەو ساتە کەس لێی تێر دەبێت؟

● ئەری مرۆڤ بیر ناکاتەوە لەوەی، کە کاتێك بۆ سەوزە فرۆش و بەقاڵ و قەسابان دەبژێرێت، وا پێویست دەکات بۆ خاوەنە ئەسڵییەکەی ئەو نیعمەتانەش ببژێرێت؟ بەڵێ شوکرانە ئەو بژاردنەیە.



پێغەمبەریشمان (دروودی خودای لێبێت) لە فەرموودەیەکدا ئاماژە بەو خۆشییە دەدات و دەفەرمووێت:

"ڕۆژووەوان دوو خۆشیی بۆ هەیە: یەکەمیان خۆشیی ڕۆژوو شکاندنە لە کاتی بەربانگدا، ئەوەی تریشیان خۆشیی ئەو کاتەیە دەگاتەوە لای پەروەردگاری و پاداشتی بەڕۆژوو بوونەکەی وەردەگرێتەوە...". کەواتە کاتێك مرۆڤ لە بەربانگدا یادی خودا دەکات و بەدڵ دەڵێت: "الحمد لله، شوکر بۆ تۆ خودایە" دڵشاد دەبێت. بەڵام خۆشییە گەورەکە ئەو کاتەیە کە بە دیداری خودا دەگات و ئەو خێرانە دەبینێت کە بەهۆی بەڕۆژوو بوونەکەیەوە بە دەستی هێناون. مانگی ڕەمەزان پێشانگای خێری زۆر و زەبەندە. لە کاتێکدا کە لە کاتەکانی تردا پاداشتی خوێندنی پیتێکی قورئان دە خێرە ئەوا لە ڕەمەزاندا هەزارە، تەنانەت لە شەوی قەدردا دەگاتە سی هەزاریش. لەم سۆنگەیەوە ڕەمەزان لە بازرگانی کردن بۆ ڕۆژی دوایی، وەرزێکی بازرگانیی وایە کە قازانج و بەرەکەت تێیدا گەلێك زۆرە.



ئەم گەورەیی و بەرزییەی ڕەمەزان بەهۆی قورئانی پیرۆزەوەیە، چونکە هاتنە خوارەوەی قورئان بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لێ

بێت) لەم مانگەدا دەستی پێکردووە، بە قورئانیش گزنگی ڕزگاریی مرۆڤایەتی دەرکەوت. موسوڵمانانیش لەو گزنگ دانەی مانگی قورئانەوە کەوتنە ڕۆژوو گرتن و لەو ڕێیەوە ساڵانە یادی هاتنە خوارەوەی کەلامی خودا دەکەنەوە. کەواتە بەڕۆژوو بوون ڕێز نواندنێکیشە بەرانبەر بە قورئان و ئەو خودایەی بۆ ڕزگاریی مرۆڤایەتی هەناردوویەتی.



● ڕەمەزانی پیرۆز مانگی قورئانە، تێیدا پاداشتی خوێندنەوەی پیتێکی قورئان هەزار چاکەیە و لە شەوی قەدریشدا دەگاتە سی هەزار.

## مانگی ئارامگری

پێغەمبەرمان (درودی خودای لێبێت) لە فەرموودەیەکی تریدا دەفەرموێت: "ڕەمەزان مانگی ئارامگرییە، پاداشتی ئارامگرتنیش بەهەشتە". یەکێك لە سیفەتەکانی موسوڵمانی کامڵ ئارامگرییە. بابوباپیرانمان وتوویانە: "بە ئارامگرتن بەرسیلە دەبێت بە حەڵوا".

دەروێشیش ئارام بگرێت مرازی حاسڵ دەبێت. ئارامگری کە بەو جۆرە مرۆڤ پێدەگەیەنێت و پایەداری دەکات، سێ جۆرە:

١- ئارامگرتن لەسەر درێژەدان بە کاری چاکە و باوەڕداری و پەرستشەکان

٢- ئارامگرتن لەسەر خۆبەدوورگرتن لە گوناه و خراپەکاری.

٣- ئارامگرتن لە هەمبەر ئازار و ناخۆشی.

لە ڕۆژووگرتندا هەر سێ جۆرەکەی ئارامگرتن بوونی هەیە. ڕۆژووەوان ناچارە بەر لە ڕۆژهەڵات تا ڕۆژئاوا بێخواردن و خواردنەوە بباتە سەر. لەگەڵ ئەوەشدا لەسەریەتی کاری چاك و خێر بکات، نوێژ بکات، گوێ لە قورئان بگرێت و... هتد. بێگومان بەردەوام بوون لەسەر ئەمانە لەڕێی ئارامگرییەوە دێتەدی. ئینجا لەسەری پێویستە خۆی لە خراپە و پاروی حەرام و ئازاردانی خەڵکی و درۆکردن بەدوور بگرێت. هەموو ئەمانەش هەر بە ئارامگرتن دێنەدی. ئەگەر نا، ئەو کەسەی خۆی بەدوور بگرێت لەو خواردنە حەڵاڵانەی کە خودا بە شێوەیەکی کاتی لێی حەرام کردوون، بەڵام لەو لاوە گوناه گەلێك ئەنجام بدات کە خودا بە بەردەوامی قەدەغەی کردوون، چیی پێدەبڕێت؟



ئینجا، کەسێك لەسەر نانخواردنی سێ

ژەمە ڕاهاتبێت، گەر نان نـەخوات سـكی قـۆڕەی دێـت بەتایبـەتی لـە كاتی هاتنی ژەمەكاندا. خۆڕاگری بەرانبەر بەمـە و بەرانبـەر خواردنـە ئامادەكراوەكانی چێشتخانە ئارامگرتن نەبێت چی ئارامگرتنە؟

ئا بەم جۆرە ڕۆژوو ڕاهێنانێكی تەواوی ئـارامگری بـە موسـوڵمانان دەكـات لـە ڕێـی هـەر سـێ جۆرەكەیـەوە. لـە قورئـانی پیرۆزیشـدا گرنگییـەكی زۆر بـە ئـارامگرتن دراوە، خـودای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿إِنَّ اللَّـهَ مَـعَ الصَّـابِرِينَ﴾ واتـە: خـودا لەگـەڵ ئارامگراندایـە. پێغەمبـەریش (درووودی خـودای لێبێـت) جـەخت لەسـەر گرنگیـی ئارامگرتن دەكاتەوە و دەفـەرمووێت: "ئـارامگرتن نیـوەی بـاوەڕە". ئەوەی دان بەخۆدا بگرێت، پتر بەرگەی ئازار و مەینەتییەكانی ژیان و هەموو جۆرە نەبوونییەك دەگرێت. مرۆڤ لـە ڕەمـەزانی هـەر ساڵێكدا زیاتر ئالوودەی ئارامگرتن دەبێت، بۆیە كە تووشی بەلا و موسیبەتێك دەبێت بەسەر خۆیدا زاڵ دەبێت و، هەر وا بەئاسانی بێ ئومێد نابێت، لـەرزۆك نابێـت و دەردی ڕۆحـی و ئـەقڵی ڕایناماڵێـت. بۆیـە لـە وڵاتـە ئیسلامییەكاندا ڕێژەی نەخۆشـی ڕۆحـی و خۆكوشـتن لەچـاو وڵاتـانی دی زۆر كەمە.

بۆ موسوڵمانێك كە هۆگری ئـارامگرتن بووبێـت، تەنانـەت مـردنیش شتێك نییە بەرگەی نەگیرێت. كەسێكی لێ بمرێت ڕووی خۆی نارنێت، قـژی دەرناهێنێـت، خـۆی وەك مـردوو لێناكـات، چـونكە لـە مـانگی قورئاندا خۆی ڕاهێناوە لەسەر خۆڕاگریی و ئارامگریی.

کە بەم جۆرە کۆتاییمان بە باسی ڕۆژوو هێنا، یەشار بە کەمێك سڵەمینەوە دەستی هەڵبڕی.

– یەشار! قسە بکە. خۆ پرسیار کردن نەنگی نییە. بێ هیچ سڵەمینەوەیەك پرسیارەکەت بکە.

– مامۆستا! ئەگەر چی جەنابت گوتت پێویستە بەرگەی ئازاری برسێتی بگرین و باسی سوودەکانی ئەو خۆڕاگرییەشت کرد، بەڵام من کە بەڕۆژوو دەبم ئەوەندە بێتاقەت دەبم، وا هەست دەکەم گەدەم خۆی دەخواتەوە و لەناو دەچێت. هەر بۆیە ڕەمەزانی ڕابردوو، بە هەزار حاڵ نیوەیم گرت. ئایا ئاینەکەمان مۆڵەت بە یەکێك دەدات وەکو من بەرگەی ڕۆژوو نەگرێت؟

– زۆر باشە، ئینجا با بێینە سەر ئەوانەی بەرگەی ڕۆژوو گرتن ناگرن.

گۆناکانی یەشار بەو شەپۆڵە زەردەخەنەیەی پۆلەکەی گرتبووەوە سوور هەڵگەڕابوون. ئەو قەڵەوترین قوتابیی پۆلەکە بوو.

– یەشار! خووگرتن بە کارێکی بەسوود و ڕاهاتن لەسەری هەر وا ئاسان نییە. بەڵکو پێویستیی بە هەندێك خۆڕاهێنان هەیە. حەز دەکەم ئەم خاڵەش بزانیت کە پسپۆڕەکان لەسەری کۆکن:

لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکدا کە لە کۆلیژی پزیشکیی زانکۆی ئەرزەڕۆمدا ئەنجام دراوە، دەرکەوتووە ئەو ڕۆژووەی ئاینەکەمان فەرمانی لەسەر داوە نابێتە هۆی برسێتییەکی تەواو. واتە نابێتە هۆی

برسێتییەکی فسیۆلۆژیی وا کە زیان بە جەستەمان بگەیەنێت، چونکە ئەو خۆراك و چەورییەی جەستە لای خۆی کۆی کردوونەتەوە لە کاتی ڕۆژوودا بۆی دەبن بە خۆراك. ئەم کەمبوونەوەی چەورییە زۆر نەخۆشی ناهێڵێت. ئەو برسێتییەی لە ماوەی ڕۆژوو گرتندا هەستی پێدەکرێت برسێتییەکی ڕاستەقینە نییە، بەڵکو برسێتیەکی دەروونییە. واتە ئەو هەست کردن بە برسێتییە لە گۆڕینی کاتی نانخواردن بۆ کاتێکی جیا لەوەی کەسەکە لێی ڕاهاتووە سەرچاوە دەگرێت. بەم جۆرە بزانە بەڕۆژوو بوون برسێتییەکی تەواوی لێناکەوێتەوە و، لە ئاست کاریگەرییە دەروونییەکەی برسێتی خۆت بگرە. ئەو کات زەحمەتییەکانی ڕۆژانی یەکەم کۆتایی دێت و دوای ئەوە وەك هاوڕێکانت ڕۆژووت بەئاسانی پێدەگیرێت.



گومانی تێدا نییە کە هەموومان لە ڕۆژانی بەرایی ڕەمەزاندا هەندێك زەحمەتی دەکێشین، ئیٚ خۆ ئەوەندەش هەر دەبێت... پاداشتی پەرستشەکان هێندە زۆرن گەر بیریان لێبکەینەوە، ئەم سووکە زەحمەتییانە لەبەر چاومان نامێنن.



## نامەیەك بۆ ئەسەنگوڵ

چەند ڕۆژێك لە دووەم نامەی (ئەسەنگوڵ) ڕامام. ئەوە نامە نەبوو، بەڵكو هاوار و ناڵە بوو. كێ دەزانێت چەند كەسی تری هاوشێوەی ئەسەنگوڵ هەیە؟ ئەوانەی وەك ئەسەنگوڵ باوەڕیان كز و لەرزۆك بووە و لە پەرستشەكان دوور كەوتوونەتەوە. ئەوانەی لە ژێر كاریگەریی دەوروبەر و هاوڕێكانیان و لەوانەش واوەتر خێزانەكانیان، خەریكە تیشكی باوەڕ لە دڵەكانیان دەكوژێتەوە.

ئەسەنگوڵی منیش یەكێكە لەوان، تەنها یەكێك، بەڵام من هاوار دەكەم تا دەنگم بگاتە گوێی هەموو ئەوانە، بە چاوی پڕ ئەسرینەوە بانگیان دەكەم و لێیان دەپاڕێمەوە:

" ڕۆڵەكانم، ڕۆحەكانم! سەر مەكەنە ئەو كۆڵانانەی ئەوسەریان داخراوە، ئەو ڕێیانەی بەرەو هەڵدێری گوناهتان دەبەن، بزڤڕن، بگەڕێنەوە".

ئەوان هەزارانن و منیش ئاوا بانگیان دەکەمەوە، تا قورگم دەدڕێ هاوار دەکەم. نازانم دەبێ گوێم بۆ شل بکەن؟! دەترسم گاڵتەم پێبکەن و بە جۆرێک بجوولێنەوە، وەك ئەوەی نە بایان دیبێت نە باران. هەندێك جار بۆ ماوەیەك بێئومێدی ڕووم تێدەکات. هاوارەکانم لە قورگم دەرناچن و قورگم دەگیرێت، نغرۆی ئارەقە و فرمێسك دەبم.

ئەو هەزاران ئەسەنگوڵە بۆ خۆیان دێن و دەڕۆن. هەر چی منیشم ئیدی نە ئەو دەنگەم ماوە بتوانم هاواریان بۆ بکەم و لەبەریان بپاڕێمەوە، نە ئەو هێز و حەوسەڵەیەشم ماوە بە شوێنیاندا بچم. بە دەست ئازارێکی بێئامانەوە بە لادا دێم. نازانم، شوانێکم ڕانەکەم گوم کردووە، یان غافڵێکم نەمتوانیوە ئەوەی پێم سپێردراوە بیپارێزم. پرسیار لە خۆم دەکەم: کێ بوو و بە چ فێڵێك تەنگی بە دڵە پاك و خاوێنەکانی ڕۆڵەکانم هەڵچنی؟ لەو کاتەدا چەند ئەسەنگوڵێك لە نێوان خۆیاندا دەیکەن بە فسکە فسك، بە سەر ڕاڕاییان زاڵ دەبن و دێنە لام، بە وەستانیان دیارە سینەیان پڕ غەم و دیدەیان پڕ نەمە.



یەکێکیان ئەسەنگوڵەکەی خۆمە، ئەو ئەسەنگوڵەی زریکەی دڵە باوەڕدارەکەی لە نامەکانیانەوە دێت...

وەك بلّێی بە نوێنەرایەتیی گشت هاوتەمەنەكانی هاتووە و لە سەر چیچكان دانیشتووە، بە ڕێز و خۆشەویستییەوە دەڵێت:

- "مامۆستا گیان! هەوڵ و ماندوو بوون و وتەكانت بە فیڕۆ نەچوونە. بڕوانە ئێمە هاتووین لە گوناهكاری و سەرەڕۆیی پاشگەز بووینەتەوە و گەڕاوینەتەوە. خەفەتیش بۆ ئەوانە مەخۆ كە هێشتا نەگەڕاونەتەوە، گومانت نەبێت لەوەی كە ئەوانیش دێنەوە. ڕۆژێك هەر دێت كە تێبگەن بێباوەڕی بەرگەی ناگیرێت و لە دەست گوناهەكان هەست بە ئازار بكەن..."

بەڵێ ڕاستە، ڕۆژێك هەر دێت بێنەوە، بێگومان... بێگومان... بێگومان... كە ئەو سپێدەیە لە خەو بێدار بوومەوە لەبەر خۆمەوە هەر دەمگوت: "بەڵێ، بێگومان... بەڵێ، بێگومان". گومان لەوەدا نییە گەنجەكانمان لە ڕێی گوناهكاری و كۆڵانە كوێرەكانی بێباوەڕی هەر دێنەوە، بۆیە نابێت بێ ئومێد بین لێیان و لە بانگ كردنەوەیان وەڕس بین. ئەو ڕۆژە یەكەم كارم ئەوە بوو وەڵامی نامەكەی ئەسەنگوڵ بدەمەوە. كە قەڵەمەكەم گرتە دەست لە ناخمدا هەستم بە دڵنیایی و ئاسوودەیی دەكرد. كە ڕوو دەكەمە ئەسەنگوڵ دەبێت ڕاستییەكان بێژم، دەبێت ئەویش گوێم بۆ ڕادێرێت، بۆ ئەوەی ئەو ڕۆژەی گەڕایەوە بزانێت بۆ كوێ بگەڕێتەوە، بزانێت بۆ كوێ و چۆن و بە چی بگەڕێتەوە. بەو نزایەوە دەستم پێكرد كە خودا ئەم پەیامە وەك ئەو گوریسە لێبكات كە بۆ كەسێك كە كەوتووەتە بیرێكی

بێبنەوە، شۆڕکراوەتەوە. سەرەتا خەونەکەمم بۆ گێڕایەوە، ئینجا بەم جۆرە درێژەم دایێ:

– ئازیزەکەم، ئەسەنگوڵ!

لە مەینەتییەکانت دەگەم ئەوەی دەیڵێیت ڕاستە، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانیت موسوڵمانێتیی ئێمە بەوانەوە تەواوە، واتە ژیان وەك ئەوەی ئیسلام دەیخوازێت چەند زەحمەت بێت، پاداشتیش ئەوەندە زیاد دەبێت. ئەوەشمان لە یاد نەچێت بوونی زەحمەتییەکان لە تاقیکردنەوەی دونیادا شتێکی سروشتییە. پێغەمبەران و پیاوە دڵسۆزەکان گرانترین تاقیکردنەوەیان بە سەردا هاتووە. ئەوەی ئەوان بینیویانە گەلێك گەلێك لەوەی ئێمە زەحمەتتر بووە، ئەوەی ئێمە بەرگەی ناگرین ئەوان بە سەریاندا هاتووە.

لێدان و کوتان و شار بە دەرکردن، زامدارکردن و ئەشکەنجەدران و کوژران، چارەنووسی زۆربەی پێغەمبەران(سەلامی خوایان لێ بێ) بووە. ئەم تەنگوچەڵەمانە لە کردەوە چاکەکانی زیاد کردوون و پایەی بەرز کردوونەتەوە.

تاقیکردنەوەی دونیا بەختەوەرییەکی هەتاهەتاییمان بۆ دەستەبەر دەکات. بۆ بەدەستهێنانی ئەنجامێکی ئاوا گەورە و بەرز، دەبێت بەرگەی نارەحەتییە بچووکەکانی ئەم ژیانی دونیایە بگرین. چونکە "وەك چۆن بەهەشت هەرزان نییە، دۆزەخیش هەر وا بەبەلاش دروست نەکراوە".

پێغەمبەریشـمان (دروودی خـودای لێبێـت) لـە فەرموودەیەکـدا دەفەرموێت: (لە دەور و زەمانێکدا کە ئوممەتەکەم تێکدەچێت، ئەوەی دەست بە سوننەتی منەوە بگرێت -واتە شوێن پێی من هەڵبگرێت- پاداشتی سەد شەهید بە دەست دەهێنێت).

ئەم هەموو پاداشتە بۆ؟ چونکە ژمارەی ئەوانەی پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) دەکەنە سەر مەشق لە ژیاندا کەم دەکات، هەر شتێکیش کە کەم بوو بەنرخ دەبێت، ئەی وا نییە؟

هەمدیس لە فەرموودەیەکی تریدا، هەر وەك بڵێی باسی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دەکات، دەفەرموێت:



"سەردەمانێکی وا بەسەر ئوممەتەکەمدا دێت، کە دەست گرتن بەم ئاینەوە بەقەد بە دەستەوە گرتنی ئاگرێکی گڕگرتوو زەحمەت دەبێت".

ئێمەی موسوڵمانانی ئەمڕۆ پشکێکی گەورەمان لەم فەرموودەیە بەردەکەوێت، چونکە باش و خراپ، حەرام و حەڵاڵ، ڕاستی و درۆ بە چەشنێك تێکەڵ بە یەك بوونە لێك جیاکردنەوەیان زۆر زەحمەتە. بۆیە کەسێك بیەوێت بیروباوەڕی پارێزراو بێت، دەبێت زۆر وریا و ئارامگر بێت. موسوڵمان کاتێك دەتوانێت موسوڵمانانە بژی، خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی زۆر بێت تا بتوانێت ڕاستییەکان بدۆزێتەوە و، خاوەنی

ئیرادەیەکی بەهێزیش بێت تا بتوانێت ئەو ڕاستییانە هەڵبژێرێت، هەر وەك ئارامگریش بێت تا بتوانێت درێژە بەو حاڵەی بدات. دەبێت بزانین ئەمەش هەر وا ئاسان نییە، لە هەمان کاتدا ئەوەشمان لەبەر چاو بێت کە پاداشتێکی گەلێك گەورەی بە دواوەیە. دەزانیت پاداشتی سەد شەهید چەندە؟ لە کاتێکدا کە موسوڵمانانی چەرخی یەکەم ئەگەر هەرچی کارێکی چاکە هەیە، بە زیادەشەوە ئەنجامیان دابێت نەیان توانیبێت پاداشتی شەهیدێك بە دەست بێنن، بۆچی گفتی پاداشتی سەد شەهید دراوە بە (بۆ نموونە) چەرخی دەیەم؟



مادام پاداشتەکە ئەوەندە گەورەیە، دەبێت بەرگەی دەردەسەرییەکان بگیرێت. وەك چۆن ئێشکگری لە ناوچەیەکی ستراتیژی و مەترسیدار چەند قاتی هی کاتی ئاشتی بەنرخە، موسوڵمانێتیی ئەمڕۆش ئەوەندە لە هی سەردەمە ئارامەکان (بێخەم و دەردەسەرییەکان) خێرترە و حسێبی بۆ دەکرێت. لە حاڵێکدا کە خەڵکی پشتیان لە ئیسلام و پەرستشەکانی کردووە، ئەگەر بێت و ئەسەنگوڵ دان بە خۆیدا بگرێت و بەردەوام بێت لە سەر پەرستشەکانی، مانای وایە پاداشتێکی گەلێك زۆر بەدەست دەهێنێت. ئەم بارودۆخە هەلێکە بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین پاداشت بە کەمترین پەرستش.

خۆشەویستەکەم، ئەسەنگوڵ!

ناکا وا تێبگەیت ئەو هاوڕێیانەت کە بەپێچەوانەی بیروباوەڕمان دەژین و شوێن گوناه کەوتوون ئاسوودەن. بەڕاستی ئەوان، ئەوانەن کە دەبێت سکمان پێیان بسووتێ، چونکە بەدەست ئازارەوە دەتلێنەوە و لە باتی ئەوەی بۆ حاڵی خۆیان بگرین قاقایانە. ئەم قاقای پێکەنینەیان ئەسرینەکانیان ڕووپۆش دەکات. کردنی هەر گوناهێك پەشیمانییەکە. هەر لە ڕێی خودا دەرچوونێك خۆی بۆ خۆی سزایە، بۆیە پێویستی بە سزای زیاتر نییە. خودی گوناه سزایەکە بەسە بۆ ئەوەی دەیکات.

دە پێم بڵێ، ئەسەنگوڵەکەم! ئەوە چ گوناهێکە کێشت دەکات؟ عەرەق خواردنە کە بووەتە گەورەترین بەڵای ئەم دونیایە؟ یان ئاڵوودەییە بەو ماددە هۆشبەرانەی مرۆڤ لە مرۆڤایەتی دەخەن؟ یان ئەو ڕابواردنە سەرشێتانانە و پەیوەندیی کوڕ و کچە سەرەڕۆیانەیە کە ئێستا و ئایندەی هاوتەمەنەکانت ڕەش دەکات؟ یانیش ئارەزووی شوێن کەوتنی مودێلە سەرشێتانەکانی جل و بەرگە؟

نەخێر، نا... دڵە باوەڕدار و مێشکە هۆشیارەکەی تۆ، وێڵی ئەمانە نین و نابن. دڵنیام ئەسەنگوڵەکەی من ئەگەر بە تاقی تەنیاش بمێنێتەوە، ئەوە وەك ئەو فەرماندەیەی هەر خۆی لە نێو قەڵادا ماوەتەوە و لە بەرگریی کردن چۆك دانادات، بەرگریی لە قەڵای باوەڕ و ڕەوشت و پەرستشی خۆی دەکات.

کچە خۆشەویستەکەم!

دەزانی بۆچی دەمەوێت ئاوا لەسەر خۆبەدوورگرتن لە گوناهکاری سوور بیت؟ لەبەرئەوەی زۆر جار بێئەوەی هەستی پێبکەین یان بە دەستی خۆمان بێت تووشی گوناه دەبین. ئینجا نۆرەی ئەوەیە بە ویست و تامەزرۆییەوە گوناه بکەین و پلانی بۆ دابنێین و وا هەست بکەین بەختەوەریمان لێوە دەست دەکەوێت!

پاشان حەز دەکەم ئەوە بزانیت گوناهەکان مرۆڤ ئالوودە دەکەن. بەڵێ، ئەسەنگوڵ! گوناهەکانیش خەڵکی ئالوودە دەکەن. ئالوودەیی مرۆڤ ڕادێنێت و هەندێك جار وای لێدەکات کە ئەگەر زیانەکانی ئەو نەهامەتییانەش بزانێت کە لێی دەکەونەوە هەر لێی نەگەڕێتەوە. ئایا مرۆڤ ئالوودەی ژەهریش دەبێت؟ ئەی چۆن! ئەی ئەوە نییە خەڵکی ئالوودەی ماددە هۆشبەرەکان دەبن؟ ئەی ئەوە نییە خەڵکی بەهۆی مەیەوە لە هۆش دەچن و گیانیان دەردەچێت؟



هەر چەندە مرۆڤ لە گوناه و ئالوودە بوون پێی هیچی دەست ناکەوێت و دڵی داناکەوێت، کەچی ناتوانێت خۆیشی لە دەستی قوتار بکات. ئەوانەی شوێنی گوناه دەکەون هەم لەم دونیایە و هەمیش لەو دونیا خەجاڵەتبار دەبن. ئەو خەجاڵەتبارییەی هەر دوو دونیا لەبەر

چـییە؟ یـەکێك لـە هۆکـارە سـەرەکییەکانی، لـەم ڕسـتە کـورت و کرۆکدارەدا خۆی دەبینێتەوە:

**"لە هەر گوناهێکەوە ڕێیەك هەیە کە بۆ دۆزەخ دەچێت".**

گوناهەکان چۆن چۆنی سەر دەکێشن بۆ کوفر –واتە بێباوەڕی–؟ بەوەی کە مرۆڤـ بەردەوام دەبێت لەسـەر ئـەو کارانـە و ئەمـەش ڕێـی بێباوەڕی دەکاتەوە و بەرینی دەکات...

پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) بەم جۆرە ڕاڤەی ئەمە دەکـات: **(هەر گوناهێك خاڵێکی ڕەشە و دەکەوێتە دڵەوە. ئەگەر زوو بە تۆبە و پەشیمانی نەسڕێنەوە، خاڵەکان لەگـەڵ تێپـەڕبوونی کاتـدا زیـاد دەکـەن و دڵ ڕەش هەڵدەگـەڕێنن. دڵ بـە نـووری ئیمـانیش دەدرەوشێتەوە).**

جا نازانم، ئەسەنگوڵ کامیان هەڵدەبژێرێت، دڵێکی بێباوەڕی ڕەش هەڵگەڕاو بە گوناه و تاوان، یان دڵێکی باوەڕداری چراخان بـە نـووری ئیمان؟

بـۆ ئەسـەنگوڵ، خـەیاڵم بـە لای هـی یەکەمـدا نـاڕوات. ئـەو ئەسەنگوڵەی من دەیناسم هەر بیریشی لێناکاتەوە. بـیری لێناکاتـەوە و ناشبێت بیری لێبکاتەوە!

تۆ بڵێی ئەسەنگوڵ بێئومێدم بکات، نا نـا! بەرگـەی ئـەوە نـاگرم، دڵە پاکەکەی ئەویش بەرگەی ناگرێت.

حەز دەکەم ئەوەش بزانیت کە تۆ ئەو تەنهایەش نیت، وەك ئەوەی بۆی دەچێت. گەلێك زۆرن ئەوانەی هانت دەدەن لەسەر باوەڕ و ئاکار و پەرستشەکانت. بۆ نموونە ئەو وانانەی دەیانخوێنیت لە بەرەی تۆ و باوەڕەکەتدان.

وەك چۆن بیرکاری و تەنەئەندازە ڕێککارییەکانی خودامان لە دونیادا بۆ ڕوون دەکەنەوە، ئاواش زیندەوەرزانی دەستڕەنگینییە سەرسوڕهێنەرەکانی خودا لە زیندەوەراندا بۆ ئێمە دەخاتە بەر چاو، دەروونزانیش باسی پێکهاتەی ڕۆحیی خۆمان بۆ دەکات، ئەدەب سۆفیگەری لێکدەداتەوە، جوگرافیا لە کێو و دەریاکانی سەر ڕووی زەوی دەکۆڵێتەوە. ئەمانە هەموو پێکەوە گەورەیی و تاك و تەنهایی پەروەردگارمان بۆ شرۆڤە دەکەن، ئەی وا نییە؟

تۆ گوێ لەوانە مەگرە کە ڕاڤەیەکی بێباوەڕانە بۆ ئەم وانانە دەکەن، بەڵکو گوێ بۆ خودی وانەکان بگرە و لەو پەنجەرانەوە –کە لەم زانستانەوە بە ڕووی باوەڕدا دەکرێنەوە– بڕوانە. چونکە هەر یەك لەو زانستانە ئاماژە بە خودای خاوەنیان دەدەن.

***

کچە گرانبەهاکەم!

دڵنیا بە بە تاقی تەنیا نیت، هەزاران پێغەمبەر و دەیان هەزار ئەولیا بە باوەڕەکەی تۆوە ژیاون.

ئەگـەر هەسـتی بێکەسـی زۆری بـۆ هێنایـت، یـادی پێغەمبـەری مەزنمان (دروودی خودای لێبێـت) بکـەوە. لـەم دونیـا پـان و پـۆڕەدا تـەنها بـوو، هـەر خـۆی بـە تـاقی تـەنها ئـاڵای بـاوەڕ بـە خـودای هەڵگرتبوو... بەڵام گەلێك بەهێز و گەشبین بوو. متمانەیەکی زۆری بە خودا هەبوو، ئەمە سەرچاوەی هێز و ئومێدی بـوو. یـەکێك بـڕوای بـە خودا هەبێت و ورەی بـەو بـەرز بێت لە کـێ دەگەڕێتـەوە؟ کـێ دەتوانێـت ئـەو ورە بـەرزەی بڕووخێنێت؟ کەس ناتوانێت...



هـەر چـەند چـاویان لـێ سوورکردەوە، هێرشـیان کـردە سـەر، سـووکایەتییان پێکـرد، ئابڵۆوقەیان خستە سەر سوودی نەبوو. ئەوە نییە پێی دەڵێن: ئەگـەر دەخوازیت دەتکەین بە سالاری خۆمان، ئەگەر زێڕ و زیـوت مەبەسـتە لەنێو ماڵ و ساماندا وا نغرۆت دەکـەین ببیـت بـە دەوڵەمەنـدترینمان، نازەنینترین کچانی مەککەت بۆ دەهێنین، کامیانت ویسـت دەتـدەینێ بەس تۆ سووکایەتی بـە بتـەکانمان مەکـە و باسـی بـوون و تاقانـەیی خودا مەکە.

ئەو کەڵـەپیاوە، ئـەو دوا پێغەمبـەرە (دروودی خـوای لێ بـێ) بـەم فەرموودە پڕمانایە –کە دەربڕی گەورەییەتی– وەڵامیان دەداتەوە:

"ئەگەر خۆر لەسەر دەستی ڕاست و مانگیش لەسەر دەستی چەپم دابنێن، من دەست هەڵناگرم!"

ئەوەی لەسەر هەق بوو سەرکەوت، ئەو بیروباوەڕەی خۆشەویست (دروودی خودای لێبێت) هەر خۆی بەتەنیا داکۆکیی لێکرد، دوای ماوەیەك چۆکی بە تەواوی بێباوەڕان دادا. لەمەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەوەی لەسەر هەق و باوەڕە دەبێت بەهێز و خۆڕاگر بێت. بوونی باوەڕ بە خودا، یارمەتیی خودا دەستەبەر دەکات. مرۆڤیش کە خودا یارمەتیی بدات، دەتوانێت خۆی لەو کارانە بەدوور بگرێت کە خودا قەدەغەی کردوون.

***

کچە سەنگینەکەم!



تۆ زۆریش بەبەختیت، ئەگەر لە دەوروبەریشتدا نەبێت ئەوە لە وڵاتەکەتدا گەلێك باوەڕدار هەیە، هەر بۆیە بەتەنیا نیت. ئینجا زۆربەی ئەوانەی بەهۆی باوەڕ و پەرستشەکانتەوە گاڵتەت پێدەکەن، یان بەهۆی نەفامییانەوەیە یانیش بەهۆی ئەوەوەیە کە بە پەروەردەیەکی دوور لە ئایین گۆشکراون، چونکە ئەگەر کەمێك لەگەڵیاندا بڕۆیت، گشتیان دەڵێن باوەڕمان بە خودا هەیە و

موســـولّمانین. ڕاســـته موســـولّمانن، بـــەلاّم بەداخـــەوە هەســـتی موســـولّمانێتی تێیانـــدا نـــەڕواوە. ئـــەوان هـــەروا دەوروبـــەری خۆیـــان بینیوە، بۆیە هەر وا پەروەردە بوونە.... دەخوازم کچەکەی من ببێتە فریادڕەسی ئەوانیش، بێ وەڕس بوون و بێ وچان بیروباوەڕی خـۆی بپارێزێـت و پەرستشـەکانی بکـات و ببێتـە نموونـە و سەرمەشـق بـۆ ئەوانی تریش. دڵنیاشم ڕۆژێك دێت پێم ڕادەگەیەنێت کە هاوڕێکانیشی دەستیان بەم جۆرە ژیانەی ئەو کردووە. هیچ گومانێکم نییە لەمـەدا، چونکە هەموو دڵەکان عەودالّی ئیمان و ئیسلامن و بەدوویدا وێڵن، بەو حەسرەتەوە دەسووتێن. ئەسەنگوڵی من دەبێتە گوریسی بـە هانـاوە هاتن بۆ ئەو کەسـانەی کەوتوونەتـە زەلکـاوەوە و پەلەقاژەیانـە و بـە هیوای ڕزگاربوونن.

بەلاّم ئەی ئەگەر ئەو ئەسەنگوڵەی ئومێدی ئـەوەم پێـی هەیـە بـە هانای خەڵکەوە بێت، ئەویش خۆی وەك ئەوان لێبکات و بڵێـت مـادام هـەموو کەسـێك کەوتووەتـە زەلکـاوەوە بـا منـیش خـۆم هەڵدەمـە ناویەوە؟... ئەو کات نەك هەر ئەسەنگوڵ، بەڵکو هەموو ئەوانەش کـە لە دەوروبەرین و چاویان لە یارمەتیی ئەوە لێیان دەقەومێت.

***

باوەڕ ناکەم ڕێی تێبچێت ئەسەنگوڵ ئەم هەنگاوانـە بنێـت. ئەگـەر ئەسەنگوڵ وا بیری بکردایەتەوە لەمێژبوو لـە دەسـتم چـووبوو، بـەلاّم ئەو هێشتا خۆی گرتووە، هێشتا بەرهەڵسـتیی ئـەو گوناهانـە دەکـات

که دەیانەوێت لە خشتەی بەرن. هەر چەندە نزیکترین کەسەکانی گاڵتەی پێدەکەن، بەڵام هێشتا لە بیروباوەڕەکەی لای نەداوە.

مەترسە ئەسەنگوڵ! تۆ نابیت بە بێباوەڕ. ئەگەر وا بوایە نامەت بە من نەدەگەیشت. مادام هێشتا دەنگت دەبیستم مانای وایە تۆم لە دەست ناچێت.

***

دەڵێیت: "پێشم بەربدە". ئەریَ بەڕاست من کۆسپم لەسەر ئەو ڕێیەی کە دەتەوێت پێیدا بەرەو گوناه بڕۆیت؟ خۆزگە من ئەو کۆسپە کاریگەرە بوومایە لە بەردەم تۆ و هاوشێوەکانتدا...

بەڵام وا هەست دەکەم ئەوەی پێشت دەگرێت باوەڕی نێو دڵتە نەك من. نازانم ڕەنگە یەکەمجار بێت ئەوانەت لە من بستبێت، بۆیە بەو کۆسپەم دابنێیت، ئەوەی دەیزانم ئەوەیە کە بەو ڕۆڵە ڕازیم. کیژۆڵەکەم! چاك بزانە بە دەستی خۆم بێت حەز دەکەم گەورە ببم گەورە ببم تا ئەو ئەندازەیەی نەتوانیت بەسەرمدا تێبپەڕیت.

***

بەر لەوەی نامەکەم کۆتایی پێ بێنم، دەمەوێ چەند ئامۆژگارییەکت بکەم:

ئەسەنگوڵ! بۆ ئەوەی لە گوناه بەدوور بیت، دەبێت تورخنی ئەو بارودۆخانە نەکەویت کە ئامادەسازیی بۆ دەکەن، دەبێت هەوڵ بدەیت نەکەویتە ئەو بوارانەی هێزی کێش کردنی گوناه تێیاندا زاڵە.

بـەردەوام ئـەو کتێبانـە بخوێنـەوە کـە بـاوەڕت بـەهێز دەکـەن، بەردەوام بـوون لـە قورئـان خوێنـدن و پـەرستشـەکان کاریگەرییـەکی زۆریان هەیە لە باوەڕ بەهێزکردن.

ئەسـەنگولێ! وا پێویسـت دەکـات ڕابمێنیـت و بـیر بکەیتـەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لێبێت) باسی لەوە کردووە کە یـەك کـاژێر بیرکردنەوە –کە مرۆڤ بەرەو خێر و زانست و چاکە ببات– لە شەست ساڵ پەرستشی سوننەت خێرترە.

گوناهەکان لەژێر دەمامکی جوان جوان خۆیان حەشارداوە، بیریان لێبکەیتەوە و لێیان ورد ببیتـەوە ڕووە گـرژ و مۆنـەکانیان دەبینیـت. هەر بە بیرکردنەوە پـەی بـەوە دەبـەیت کـە ئـەو ڕابواردنانـەی مرۆڤـ کەمەنـدکێش دەکـەن فێڵـی شـەیتانن. تێدەگـەیت کـە بـۆ ئـەوەی لـە تاقیکردنـەوەی دونیـا سـەرکەوتن بەدەسـت بێـنین، دەبێـت هەرچـی هەست و ئارەزووی خراپ هەیە لە ناخمان وەدەریان بنێین، ئەوەشـت بۆ ڕوون دەبێتەوە کە دڵە جوانەکەی تۆ بە خۆشییە کاتی و بڕاوەکان قایل نابێت و ئەوانە دەخوازێت کە هەتاهەتایی و نەبڕاوەن.

وەك بڵێی لە ئێستاوە گوێم لە زریکەی دڵتە دەڵێت:

**خۆم فانیم، ئەوەی فانی بێت نامـەوێ**

**یارم دەوێ، بەڵام یارێکی باقیم دەوێ**

* * *

ئەسـەنگولْ! دەتـوانین هـاوار و نالّـەی ئەوانـەی بـە دلّخۆشـیان دەزانین تەنانەت لـە گـۆرانی و مەقامەکانیشـیان بیبیسـتین. ئایـا لـەو گۆرانییانـەوە کـە بـۆ خۆشـی و ڕابـواردن دێنـە چـڕین، ئـازار و ژان و نارِەحەتی و بێئەمەکی فیچکەی نایـەت؟ گۆرانی و مەقامـەکان بـۆنی گریانیان لێدێت... ئـەو دلّـەی بـە شتی کاتییەوە گیرۆدە بووە، هیچ کاتێك خۆشییەکی وا بـە خۆیـەوە نابینێـــت دابکـــەوێت. چـــونکە خۆشیی ئەو خۆشییەیە بێ خەم و ناسـۆری بێـت و لـە دەسـتیش نەچێت.... باشـە ئێسـتا لـە تـۆ



دەپرسـم: کامەیـە ئـەو خۆشـییەی بێخـەم و ژانـە؟ خۆشـییەك نییـە دەورووبەری بە خەم و ژان نەتەنرابێت. ئەی کـە وا بـوو ئـەو خۆشـییە کامەیە کـە هـەردەم لـە دلْ و دەستماندا دەمێنێتـەوە؟ ئـەرێ دونیـا تەژی نییە لە لێکدابڕان و ون بوون و لـە دەسـتدان؟ کـە وایـە، نابێـت ئامانجەکانمان هەر لە دونیادا قەتیس بمێنن، بەلّکو دەبێت لـە هـەولّی ڕزگار کردنی قیامـەتمان بـین لـەپالْ دونیـادا، چـونکە مـرۆڤ تـەنها بـە خۆشی و بەختەوەریی هەتاهەتایی و بێ سەرئێشەی قیامەت دلّی ئـاو دەخواتەوە.

***

کچە دڵ گەورەکەم!

دڵەکەی تۆ بە خۆشییە ماددییەکانی دونیا – کە بڕاوەن و بە ناخۆشییەکان لێڵ بوون– داناکەوێت. ئەگەر ئەو دڵەت بشکەوێتە سەریان، لەو ڕێیە پڕ لە ئازار و بێئومێدییە دەگەڕێتەوە و هەزار جار پاشگەز دەبێتەوە. هەموو گوناهکارێك سەرئەنجام هەست بە ئازار و دڵتەنگیی و پەشیمانیی دەکات. هەزاران کتێب و فیلم و شیعر و گۆرانی باس لەمە دەکەن.

بۆ دەبێت کەسێکی ژیری وەك ئەسەنگوڵ، ڕێیەك تاقی بکاتەوە کە بەدرێژایی مێژوو ئەوەی پێیدا تێپەڕیوە پەشیمان بووەتەوە؟! شتێك کە تاقیکرابێتەوە و دەرکەوتبێت خراپە، دووبارە تاقیکردنەوەی لە کەسێکی خاوەن ئاوەز دەوەشێتەوە؟! ژیر ئەوەیە سوود لە ئەزموونی کەسانی تر وەردەگرێت.

لە کۆتایی نامەکەمدا ڕێز و سڵاو بۆ ئەسەنگوڵ دەنێرم و، لە خودای گەورە دەپاڕێمەوە دەستگرۆیی بکات بۆ بەردەوام بوون لەسەر چاکەکاریی و دوور کەوتنەوە لە خراپەکاریی.

# پێڕست